# بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا

نووسینی: د. عائیز ئەلقەرەنی

وەرگێڕانی: نیاز مەستی

نەخشەسازی ناوەوە: زەردەشت کاوانی


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەری گشتی: محمد خضر احمد 07824671394 - 07504671394
بەڕێوەبەری هونەری: مصطفی محمد کوردی 07509998182
فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/M.Ktebxana
ئینستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/M.Ktebxana
لقی یەکەم: چوارڕیانی شێخ مەحمود - بەرانبەر مزگەوتی مەحمود عەلاف
لقی دووەم: بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری
ئیمێل: mdmaktaba@gmail.com

ـەخشەسازی بەرگ: ئیبراهیم ساڵح

ـوانە: ١٤ * ٢١

ـاپی سێیەم: ٢٠٢٥ز - ١٤٤٥ک

ـاژ: ١٠٠٠

ـخ: ٥٠٠٠

ـەڕە: ٣٣٤

لەبەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخان گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان،

ژمارە سپاردنی (٩٢٧) ـی ساڵی (٢٠١٩) ـی پێدراوە.

## پێشکەشە

• بە هەموو ئەو خوشکە موسڵمانانەی کە بە خودا ڕازین و ئیسلام بە ئاینی خۆیان دەزانن و شایەتی دەدەن موحەممەد پێغەمبەرە ﷺ.

• بە گشت ئەو ئافرەتانەی ڕێگەی ڕاستییان گرتووە و هەڵگری پەیامی ڕاستیین.

• بە هەموو ئەو پەروەردەکارانەی بە وشەکانیان دەکۆشن و پارێزگاری لە ڕەوشتی خۆیان دەکەن، دڵ و دەروونی خۆیان پاکژدەکەنەوە.

• بە گشت ئەو دایکانەی منداڵەکانی خۆیان لەسەر پارێزکاری(تقوی) پەروەردە دەکەن، لەسەر سوننەت گەورەیان دەکەن و کاروکردەوەی پەسەندیان لا خۆشەویست دەکەن.

”

بۆ گشت ئافرەتێکی غەمبار و دڵتەنگ:

دڵخۆش و شادمان بە، سەبارەت بە نزیک بوونەوەت لە دەرووێک و، چاودێری خودایی و گەورەیی پاداشت و داپۆشینی تاوانەکانت.

“

## پێشەکی نووسەر

سوپاس و ستایش بۆ پەروەرێنەری جیهان، دروود و سەلام بۆ گیانی پاکی پێغەمبەریﷺ خوداﷻ و بنەماڵە و یاوەران و شوێنکەوتووان، پاشان:

ئەم کتێبە وا لە ئافرەت دەکات بە ئاینەکەی خۆی دڵخۆش بێت، بە فەزڵ و بەخششی خوداﷻ کەیفخۆش بێ، موژدەیان بەو ناز و نیعمەتانە دەداتێ کە هەیانە. بەدڵنیایی ئەم کتێبە بزەی ئاوات و شەماڵی هیوا و ئاسۆی موژدەیە. هەموو ئەوانەی دڵتەنگن و غەم و خەفەتیان زۆرە، ئەم کتێبە بانگیان دەکات چاوەڕێی دەرووی خێر بن، پاشی تەنگانە چاوەڕوانی فەرەحنایی بن. گفتوگۆ لەگەڵ ئاوەزی زیرەك و دڵی پاك و ڕۆحی خاوێنی ئەوان دەکات و پێیان دەڵێت: ئارام و خۆڕاگر بن، نائومێد و هیوابڕاو مەبن چونکە خوداتان لەگەڵدایە، بەڵێ، خوداﷻ بەستە، خوداﷻ پشتیوانتە و هەر بە خۆی دەتپارێزێ و هاوکارتە.

هۆ خوشکەکەم: ئەم کتێبەی بەردەستت بخوێنەوە، ئەم کتێبە ئایەتی قورئان و فەرموودەی ڕاست و وتە و چیرۆکی سروش و دێڕە شیعری کاریگەر و بیرۆکەی گونجاو و ئەزموونی ژیرییە. ئەم پەرتووکە بخوێنەوە تاوەکو هەرچی غەم و ناسۆر و تەمی

خەفەت و مۆتەکەی ترس و دڕدۆنگی هەیە وەدەرینێی. ئەم دیوانە بخوێنەوە تا بۆ پاککردنەوەی هزرت لە وەهمە کەڵەکەبوەکان و لە کەڕەسیسەی دڵەڕاوکێ یارمەتیت بدا ، بەرەو باغی دۆستایەتی و مێرگی شادمانی و مەنزڵی ئیمان و باخچەی دڵخۆشی و بەهەشتی کەیف و فەڕەحنایی ڕێنوێنییت بکا، بەڵکو خوداش ﷻ لە هەردوو دونیا بە بەخششی خۆی شادمانت بکا، هەر بە خۆی بەخشندە و میهرەبانە.

ئەم کتێبەم کردووەتە گەنجینەیەکی وا کە پڕ بێت لە خشڵ و خۆتانی وا پێ بڕازێننەوە کە جوانییەکەتان ببریسکێتەوە، وەکو شەوچرا دەربکەون، لە زێڕ و زیو جوانتر بن و ئارایشتی خۆتانی پێ بدەن، هەر بۆیە بەشەکانی ئەم کتێبەم بە ناوی خشڵ و زێڕ و زیو و ئەم ناوانە کردووە: خشڵ، گەردانە، ئاڵتوون، مرواری، دوڕ، زەبەر، یاقووت، گەوهەر، ئەنگوستیلە، ناوازە، مەرجان، ئەڵماس و زێوەر.

ئەگەر تۆ ئەم کتێبەت لەلا بێت ئیدی پێویستیت بە جوانکاریی دونیایی و ئارایشتی کاتیی و دیمەنی ساختە و مۆدێلی ڕۆژانە نییە. لە فیستیڤاڵی ژیان، لە ئاهەنگی دونیا، لە چەژنی شادمانی، لە وەرزی کامەرانی، خۆت بەو زێڕ و زەبەرانە بڕازێنەوە و لە شەوی خۆشی لەبەریان بکە، تاوەکو ـ ان شاء الله ـ ببیتە (بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا)

یا اسعد الناس فی دین و فی داب — بلا جمان و لا عقد و ذهب

بل بالتسبیح کالبشری مرتلة — کالغیث کالفجر کالاشراق کالسحب

| | |
|---|---|
| فی سـجدة فی دعاء فی مراقبة | فـی فكرة بين نور اللـوح و الكـتب |
| فی ومضة من سناء الغار جادبها | رسـول ربك لـلرومـان و الـعـرب |
| فانــت اسعد كل العالـمين بما | فــی قلبك الطاهر المعمور بالقرب |

**واتە: ئەی بەختەوەرترین کەس لە ئاین و لە ڕەوشت، نەك بە زێڕ و زیو و گەوهەر بەڵکو بەختەوەری بە زکر و یادی خوداﷻ، وەکو باران وەکو سپێدە، وەکو هەور، لە سوجدەدا و لە پاڕانەوە و چاودێری، لە بیرۆکەیەك لە نێوان ڕۆشنایی لەوح و کتێب. لە بریسکانەوەی ڕوناکی ئەشکەوت کە پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ڕۆم و عەرەبی هێنا. بەڵێ، تۆ بەختەوەرترین کەسی دونیای بەوەی لەو دڵە پاکەت دایە و لە خوداﷻ نزیکی.**

**ڕێی کامەرانی لە زانیارییە دروست و ڕۆشنبیرییە پوختەکەت خۆی مەڵاس داوە. بەختەوەری لە چیرۆکی ڕۆمانسی و خەیاڵی بەدەست نایێ، کە وا لە خوێنەر دەکەن هەر لەو ناوچەش دووربکەوێتەوە و ئەوەندەی دیکە لە واقیع هەڵێ و بەرەو دونیایەکی دوور لە دونیای خۆی بڕوات، لە دونیایەك پڕاوپڕە لە خەونی پەمبەیی، پڕە لە هەوێنی وەهمی سەرخۆشکەر، بەرووبومی ئەم دونیایە خەیاڵییە بە سۆدرەبردنی خوێنەرە و مۆتەکەیەکی بکوژە، بڕوا بکە لەوەش مەترسیدارترە، نمونە چیرۆکەکانی (ئاگاسا کریستی) خوێنەر فێری فرت و فێڵ و پاشقوڵ لێدان و دزی و جەردەیی دەکات. بەخۆم زنجیرە کتێبی وەرگێڕدراوی (باشترین چیرۆکەکانی دونیا)م خوێندەوە، کە زنجیرەیەکی هەتا بڵێی سەرنجڕاکێش بوو، براوەی خەڵاتی نۆبڵ بوو، بینیم ئەو چیرۆکانە**

هەڵەی گەلێك زل و نەزانانەیان تێدایە. خۆ گومانیشی تێدا نییە هەندێ لەو چیرۆکە جیهانییانە لە لایەنی هونەری چیرۆك و کاری گێڕانەوە ڕۆمانی زۆر چاکن، وەکو ڕۆمانی (پیرەمێرد و دەریا)ی ئێرنست هەمینگوای، هەروەها چیرۆکەکانی هاوشێوەی ئەمە کە وا لە مرۆڤ دەکەن لە کردەوەی خراپ و دزێو خۆ بەدوور بگرێ، لە دارمانی بەهاکانی ڕەوشت و ئاکاری لار و وێر خۆبپارێزێ.

هەر بۆیە لەسەر هەموو ئافرەتێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو پێویستە بەرهەمی چیرۆکە باشەکانی وەکو کتێبەکانی تەنتاوی و گەیلانی و مەنفەلۆتی و ڕافعی و هاوشێوەکانیان بخوێنێتەوە، ئەوانە پاکن و ویژدانێکی زیندوویان هەیە، پەیامی هۆشیاریان هەڵگرتووە، من ئەم باسەم لەبەر ئەوە هێنایە گۆڕێ چونکە پێداگرم لەسەر ئەوەی ئەم کتێبەی من لە خڵتەی بێگانان و ژەهری تێکدەران و ئاژاوەی لادەران پاکژ بێ. چەندە زۆرن ئەوانەی بوونە قوربانی وتارێك یان ڕۆمانێك، هەر خوداﷻ بمانپارێزێ.

دەی بە هەر حاڵ، هیچ چیرۆکێك لەوە باشتر و چاکتر نییە کە خوداﷻ لە قورئان و پێغەمبەرﷺ لە سوننەت و مێژووی بەنرخی پیاوچاکان هەر لە خەلیفە و زانا و پیاوچاکان گێڕاویانەتەوە.

ئیدی لەسەر بەرەکەتی خوداﷻ دەبینی تۆ چەند بەختەوەری بەو شتانەی خوداﷻ لە ئاین و هیدایەت و باوەڕ پێی داوی.

د.عـائیز ئەلقەرەنـی

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی بێ کۆتا بۆ خودای بەخشندە ﷻ، لێزمە بارانی درووود و سەلام ببارێ بەسەر گیانی پاك و موبارەکی حەزرەتی پێغەمبەری خۆشەویست (ﷺ) و یاران و یاوەران و پیاوچاکان تا ڕۆژی دوایی.

کتێبی بەردەستت وەگێڕدراوی کتێبی (اسعد مراءة في العالم) ی نووسەری ناودار د.عائیز ئەلقرنییە. نووسەر لەم کتێبەیدا ڕووی گوفتاری لە ئافرەتان کردووە، بە شێوازێکی زۆر جوان و دڵگیر لەگەڵ خوشکان دەدوێ و هەوڵ دەدا لە کێشە و ئازار و ناخۆشیەکانیان بکۆڵێتەوە و چارەسەری گونجاویان بۆ دابنێ. ئەنجامی ئەم چارەسەرییەش دەوەستێتە سەر خوێنەر ئاخۆ چەندە ئامادەباشی هەیە و ڕێوشوێنی دیاریکراو جێبەجێ دەکات.

بابەتی نێو ئەم کتێبە بە تەواوی لەگەڵ بارودۆخی ئێستامان دێتەوە، سەردەمی ئێستای ئێمە لێوان لێوە لە ترازان و داڕزان و بەلاڕێدابردن و تاوان و خراپەکاری، زۆرینەی قوربانیانی ئەم گێرەشێوێنی و فەتارەتە لە ڕەگەزی مێیە. ئەوان کراونەتە کەرەستەیەکی ئاسان و زوو حەل بۆ مەرامی بۆگەنی هەندێ دەزگا و لایەن و تەوژم و فکری جیهانی، هەر بەڕاستیش کاریگەرن.

نووسەر ئەم لایەنەی زۆر بەهەتەری (جدی) وەرگرتووە و ئیشی لەسەر کردووە، پێویستە خوێنەر دۆزی خۆی لە نێو ڕستە و پاژەکانی ئەم کتێبە بدۆزێتەوە.

لەوانەیە هەندێ کەس وا بزانن مادام ئەم کتێبە بە ناونیشانی (بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا) یە تایبەتە بە ئافرەتان و دەبێت تەنیا ئەوان بیخوێننەوە، بەدڵنیاییەوە ئەم بۆچوونە هەڵەیە چونکە ئێمە هەموومان هەڵقوڵاوی یەك کانیین و تۆرمەمان یەکە، وێنەی پەل و ئەندامەکانی یەك لەشین و پێوەستین بەیەکەوە، خۆ ئافرەت ماکێکی بیانی نییە لە ئاسمانەوە دابەزی بێت، بەڵکو ئافرەتان دایك و خوشك و پور و کچ و ئامۆزا و هاوکار و هاوسەری پیاوانن تا دەگاتە قوتابی و دراوسێ.

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە هەر باش و دانسقەکان، بە دووەم کتێبی نووسەر دادەنرێت لە چاکی و پڕفرۆشی، بۆ چەندین زمانی دونیا وەرگێڕدراوە. بەسەدان هەزار دانە بە زمانگەلە زیندووەکانی دونیای لێ فرۆشراوە و دەیان جار چاپکراوەتەوە. تا ساڵی ٢٠٠٩ز چاپی چواردەمی کراوە.

بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا کتبێکە تێیدا کورتبڕی و هێزی وشە و زانیاری نوێ گرنگی تەواوی پێدراوە. نووسەر دەیەوێ بێ زۆر لە خۆکردن، وا لە خوێنەر بکات هەر ئەمڕۆ بڕیار بدات و ژیانی خۆی بگۆڕێ. واتە ئەم کتێبە جیاواز لە هەر کتێبێکی تر، کتێبی کار و کردارە نەك بەس خوێندنەوە و سەرسام بوون پێی.

بایەخی ئەم کتێبە لەوەدایە، کۆگایەکی ڕازاوەی شیعر و پەند و ئایەت و فەرموودە و وتە و ئەزموون و زانیارییە، بابەتی مێژوویی و زانستی و گەشەپێدانی مرۆیی بەبایەخەوە بوونیان هەیە. نووسەر ئەو هەموو بابەتە جۆراوجۆرەی بە زمانێکی ئەدەبی و باڵا و دەوڵەمەند پێکەوە گونجاندووە، ئاستی نووسینی نووسەر هێندە بەرزە خوێنەر سەرسام دەکات چونکە دەیان وشە و پەیڤ و دەستەواژەی پاراو و پەتی بەکارهێناوە کە لە زۆر کتێبان ئەم شتە بەرچاو ناکەوێ.

خوێندنەوەی ئەم کتێبە ڕاستەوخۆ هەندێ شت لە ژیانت دەگۆڕێ، هەست دەکەی پەیڤەکانی دەبنە وانە و ئاگادارکەرەوە، لەگەڵ ساتەکانی ژیانت ئاوێزان دەبێت. ڕستەکانی ئەم کتێبە لەگەڵ تەپەی دڵ ڕێك دێنەوە. نووسەر وشەی بەخۆڕایی نەهێناوە، ئەوەندە بە کارامەیی وشەی هەڵبژاردووە یەکسەر سارێژی برینێك دەکات. بابەتەکانی ئەم کتێبە بێ پرس و ویستی پرسگەی خوێنەر چرتەیان دێ و دەگەنە مەنزڵی دڵ و مێشك.

ئەم کتێبە پردی بەیەکەوە بەستانی ڕۆژگاری پڕشنگداری دوێنێ و سەردەمی ئێستامانە، فێرمان دەکات چۆن پەند لە بەسەرهاتی پێشەنگە باشەکانی پێشین وەربگرین و لەمڕۆمان ئیش بە ئامۆژگاری ئەوان بکەین و سوود لە ئەزموونیان وەربگرین.

لە سەردەمی ئەمڕۆمان دەیان ڕێکخراو و مۆڵگە بە ناوی ئافرەت و مافی ئافرەت لە مەیدانەکەن و دەیان دروشمی زرقی و گەورەیان

بەرز کردووەتەوە، بێ ئەوەی بتوانن برینێك سارێژ بکەن یان دارێك بخەنە سەر بەردێك، ئەم کتێبە جێی هەموو ئەو دروشمانە دەگرێتەوە و لە دەرمانخانەکەی ئیسلام ڕەچێتەی چارەی بنەبڕی نەخۆشییەکان دەنووسێ.

بۆیە دەڵێم: حەیفە ئەم کتێبە بە ڕۆژێك یان بە چەند ڕۆژێك بخوێندرێتەوە، بەڵکو وا باشە هەر ڕۆژەی بەشێکی کەمی بخوێندرێتەوە و بە کردارەکی ئیشی پێ بکرێ. ئەگەر خوێنەر سەلیقەی باشی هەبێ، دەتوانێ سوودێکی سەرسوڕهێنەر لەم کتێبە ببینێ. بەڵێ، ئەم کتێبە دەستوور و بەرنامەی ڕۆژانەی هەرکەسێك بێ با ئەو کەسە لەنێو گەرداوی ژیان لرخەی بێ ڕاست دەبێتەوە و بەلەنگاز بەرەو لوتکە هەنگاو دەنێت.

### ئەم وەرگێڕانە:

ئەم وەرگێڕانە پڕە لە وشەی ناسك و پاراو و ئاوداری ئەدەبی چونکە کتێبەکە خۆی کەشێکی ئەدەبی بەسەردا زاڵە، لە هەمان کات زۆربەی بەرهەمی د.عائیز شیعر و ئەدەبیاتە بۆیە شێوازی نووسینی دەبڕینی پڕە لە واژەی ئەدەبیی.

خۆ دەگونجێ لە چەند شوێنێك هاوڕای نووسەر نەبم، بەڵام دەستپاکییم خستووەتە پێش، هەتا گونجا بێ دەقە ڕەسەنەکەم پاراستووە و مانا و بۆن و بەرامەی دەقەکەم هێشتووەتەوە، تەنیا لە چەند جێیەکی کەم، لادانێکی زۆر سادەم کردووە کە شایەنی باس نییە..

ئەگەر پێویستشی کردبێ تێبینییەکی زۆر بچووکم نووسیوە. نووسەر بیستساڵێك پێش ئێستە ئەم کتێبەی نووسیوە لەوانەیە خۆشی لە هەندێك لە ڕا و ڕوانینەکانی پەشیمان بووبێتەوە، هەندێك ڕستەو پەیڤ ئاڵۆز و ناشیاون بەڵام دەکرێ ڕاڤەی گونجاویان بۆ بدۆزینەوە و پاساو بۆ نووسەر بهێنینەوە.

نیاز مەستی

هەولێر/٢٠١٩

ئەمانە نقێمن، بەڵام ڕاستییەکەی چەند دەقێکن، چەند پارچە وتارێکی زانیاری پڕسوودن، کاریگەریان هەردەمێنێ، سوودیان بەردەوامە، هەر دەقێك لە نقێمێك گرانبەهاترە، چونکە گەوهەر لەناو دەچێ، زانست دەمێنێتەوە، کەوابێ شتی نەمر بەسەر شتی فەوتاو هەڵبژێرە.

**ئەم پەرتووکە بخوێنەوە،**

**تاوەکو هەرچی غەم و ناسۆر و تەمی خەفەت و مۆتەکەی ترس و دڕدۆنگی هەیە وەدەرینێی.**

**ئەم دیوانە بخوێنەوە،**

**تا یارمەتیت بدا بۆ پاککردنەوەی هزرت لە وەهمە کەڵەکەبووەکان و لە کەڕەسیسەی دڵەڕاوکێ، بەرەو مێرگی دۆستایەتی و مێرگی شادمانی و مەنزڵی ئیمان و باخچەی دڵخۆشی و بەهەشتی کەیفخۆشی ڕێنوێنییت بکا.**

## دایکم

گەورە بووم، هێشتا لای دایکم بچوکم، سەر و ڕیشم ماش و برنج بوو کەچی لای ئەو ساوامە. دایکم تاکە کەسە لەپێناوی من فرمێسك و شیر و خوێنی لەبەر ڕۆیشتووە، هێ لە دایکم هەموو خەڵکی لە بیریان کردم. جگە لە دایکم هەمووان ئازاریان دام، هەموو دونیا گۆڕا دایکم نەبێ، ئەی هاوار دایە گیان، ئاخۆ چەند جار لە کاتی گەشتکردنی من گۆنات بە فرمێسکان تەڕکردبێت!؟ چەند جاران لە بێ منی خەوت زڕا بێ! چەند جار لەبەر نەخۆشی من لە خەوی قووڵ هەستاوی! ئەی گیان دایە، کە لە سەفەرێك گەڕاومەتەوە تۆ لەبەر دەرگای وەستاوی، چاوەڕوانی منت کردووە و لە خۆشییان چاوت ئاوی کردووە، کە لە مالێ چوومەتە دەرێ هەمدیس لەبەر دەرگ بووی و دڵت خوێنی دەڵاندووە، وەی دایە گیان نۆ مانگان بە پیستەی سك بە ئیش و ئازارەوە هەڵتگرتووم، بە چ گریان و ناڵەیەك داتناووم، بە ماچ و گوڵبزە لە باوەشت کردووم. ئەڵا ئەڵا دایەگیان، نەدەنووستی تاکو من نەنووستبام، دڵت نەدەسایەوە تاکو من کەیفخۆش نەبام، من بزەیەکم کردبا تۆ بێ هۆکار پێدەکەنی، من دڵگیر بام، بێ ئەم لا و ئەولا تۆ دەگریای. پێش ئەوەی هەڵە بکەم پۆزشت بۆ دەهێنامەوە، پێش ئەوەی پەژیوان ببمەوە چاوپۆشییت لێ دەکردم، پێش داوای

لێبوردن لێم خۆش دەبووی. ئای لە تۆ دایە گیان! ئەگەر یەکێ هێندەی پێ هەڵ گوتبام تا منی دەکردە پێشەوای دونیا و مانگی تابان تۆ بە ڕاستت دەزانی، ئەوەی زەمی کردبم با شاهێدی تەواو و ماقوڵیش بوو بێ، بە درۆت خستوونەتەوە. بە تاقی تەنێ تۆ سەرقاڵی ئیش و کارم بووی، تەنیا تۆ غەمخۆرم بووی. ئەی گیان دای،ە من تاکە باس و بابەت و چیرۆك و تەناییی تۆ بووم، تۆ بۆم باش بووی و لە کەموکووڕی من چاوپۆشییت کردووە، لە تامەزۆریی من تواویتەوە و حەزت لە زیاتر توانەوە بووە. ئەی دایە گیان خۆزی بە فرمێسکی وەفا پێ و پلم شوشتبای، لە ئاهەنگی ژیان سۆڵەکانتم هەڵگرتبا. دایە گیان بریا مردن مێوانی من با و تۆی نەبردبا، کاشکی ناخۆشی وازی لە تۆ دەهێنا، ئەی قەزات لێم:

نــــاخم دەڵێ دایکت تــازە ڕۆیی تــەواو

ئەمن ڕۆحم بە قوربانت، جا پێی بزانی یان نا

خودایە، لە من و دایك و بابم خۆش بە و ڕەحمیان پێ بکە، وەکو چۆن ئەوان منیان گەورە کرد و پەروەدەیان کردم.

## یەکتاپەرست نەک خودانەناس

ئافرەت جوانی و چاکی و ڕێز و پایە و پلەی نییە، تا یەکتاپەرست نەبێت و بڕوادار و شوێنکەوتووی پێغەمبەرﷺ نەبێ، ئەگەر ئەو بنەڕەتە بەرزەی هەبوو ئەوا ڕێنوێنیکراو و وەگیراوە، ئەگەر ملی بۆ ئەم بیروباوەڕە نەدا و بڕوای بە خودا نەبوو، نکوڵی ئاینی کرد و پایەی خۆی دابەزاند، ئەوا ئافرەتێکی سوکەڵە و بێکەڵك و بێبەهایە، ئەوکات ئەگەر ئەستێرەی ئاسمانێی بۆ بکەیە ملوانکە و کەلوی لەسەری نێی و خۆر لە نێچەوانی بدرەوشێ جوان نییە، چونکە بەو نکوڵییەی لە ئیسلام هەموو بەهای ڕۆمەتی و گشت نرخی ڕووپاکی و گرنگی چاکەی لێ ئاوەژوو دەبێتەوە. نەیاری ئەو ئاینە جوغزێکی بەتاڵە لەم ژیانەدا، ئەگەر وازی لە باوەڕ هێنا و پشتی لە ئاین کرد، داکەندنی پۆشی(حیجابی) شەرم و تاجی ئیمان و جلکی سەربڵندی و بەرگی داوێنپاکی لا دەبێتە ئاوخواردنەوە.

یەکەم مەنزڵی بەختەوەری لای ئافرەت ئەوەیە بڕوای بە خودای باڵادەست و مەزن هەبێ، پێشەوای ئەو لە ژیاندا پێغەمبەرﷺ بێ و خۆشی بوێ و شوێنی بکەوێ و ژیاننامەی بخوێنێتەوە و ئیش بە فەرمانەکانی بکات، واز لە قەدەغەکراوەکانی بێنێت و لەسەر سونەتی وی بڕوا، ئەگەر لەم خاڵە دەستی پێ نەکرد با خۆی ماندوو

نەکا لە گەڕان بە دوای هەلی تر بۆ بەختەوەری، یان ڕێگەیەکی تر بۆ سەرکەوتن و سەربەرزی.

ئافرەتی خودانەناس هەموو ڕۆژێ بەرەو ماڵوێرانی و خۆکوژی دەڕوا، بۆ مردن و ئاگر دەکۆشێ، چونکە باوەڕی بە خودای تاك و توانا نییە، لەنێو بەرتەنگی و ناخۆشی و هەش بەسەری و نائومێدی و زەحمەتی دەژی، ئەوجا با لە نێو کەلوی بەرز بێ و ئاوریشم لەبەر بکا و خۆی پێ با بدا و بە هەرچی ئارایشی ئەو دونیایەی خۆ بڕازێنێتەوە، چونکە دڵی لە نوور و باوەڕ خاڵییە نە دادەکەسێ نە پشوو و دڵخۆشی و بردنەوە و هیوای هەیە، لەنێو جەرگەی تاریکی، قەیران و غەم دەژی، ئەوەی بەدوای بەختەوەرییدا وێڵە با لە ڕستەی ( لا اله الا الله محمد رسول الله) وەیدۆزێ.

## لکە زێڕینەکان

**لکی یەکەم: زۆر ئافرەتی ئەم جیهانە لە هەموو شتێ بە دوای بەختەوەری گەڕاون و لە هەموو لایەکەوە وێڵی بوون، وەلێ بەرەو باوەڕبوون بە خودا ڕێنوێنی نەکراون.**

**لکی دووەم: دڵخۆشکردنی خەڵك تەنیا بە دەست خودایە، لە خودای نەبێ لە کەسی دی داوای مەکە و مەیخوازە.**

**لکی سێیەم: دەوڵەمەندان وای بۆ چوو بوون بەختەوەری لە ماڵە، پاشایان وایان دەزانی لە دەسەڵاتە، ڕاستییەکەی بەختەوەری لە خوداپەرستییە.**

**لکی چوارەم: یەکێ لە ناودارەکان دوای موسڵمان بوونی دەڵێت: چل ساڵ بەدوای بەختەوەری گەڕام و گەڕام، تەنیا لە بڕوابوون بە خودای دیتمەوە.**

**لکی پێنجەم: ئافرەتی باش و ڕێزدار ئومێدی خێری لێ دەکرێ و لە خراپەی بێ ترسی، ئەم جۆرە سوود بە خەڵکی دەگەیەنێ و زیانی بۆ کەس نییە.**

**لکی شەشەم: ئافرەتی فێرکراو و شارەزا کتێبی بونەوەر دەخوێنێتەوە، دێڕی تاك و تەنایی دەبینێ و پیتی دەسەڵاتی خودای چاو پێ دەکەوێ.**

لکی حەوتەم: ئافرەت ئەگەر نێوانی خۆی و خودای باش کرد پیاو و منداڵەکانی بۆ چاك دەبن، منداڵی چاك و باشی لێ دەبێت.

لکی هەشتەم: شارستانییەتی ڕۆژاوا لەو بانگەشەی بەختەوەرکردنی ئافرەت ڕاست ناکا، دوای ئەوەی ئافرەتی ڕۆژاوایی و ئەو ژیانە تەنگ و تاڵەی وانمان بینی.

لکی نۆیەم: گەورەترین بەڵگە کە بیسەلمێنێ ئاین مافی ئافرەتی داوە ئەوەیە، کە خودا لە ژیاننامەی مەریەمی خوداناس و پاکیزە و ئاسیای بانگخواز و ڕاستگۆ باسی کردووە.

لکی دەیەم: ئافرەت لە خۆی ناپرسێ بۆچی ئاسیای ژنی فیرعەون کۆشك و پایەی نەویست و بەرانگژی زۆرداری بووەوە؟ چونکە بڕوای بە خودا هەبوو.

## بەخێر بێی

بەخێربێی..ئەی خوشکی نوێژکەری ڕۆژووگری خوداپەرستیی لەخوداترس.

بەخێر بێی.. ئەی خوشکی باڵاپۆشی بەڕێز و سەنگین.

بەخێر بێی.. ئەی خوشکی فێرخوازی بیرکراوەی هۆشیارو تێگەیشتوو.

بەخێربێی..ئەی خوشکی بەئەمەکی دەسپاکی ڕاستگۆی خێرخواز.

بەخێر بێی.. ئەی خوشکی ئارامگری خۆڕاگری تۆبەکار و بۆ خودا سوڵحاو.

بەخێر بێی.. ئەی خوشکی زاکیری سوپاسگوزاری بانگخواز و ئاگادار.

بەخێر بێی.. ئەی شوێنکەوتووی ئاسیا و مەریەم و خەدیجە.

بەخێر بێی.. ئەی پەروەردەکاری پاڵەوانان و، پێگەیێنەری شێرەپیاوان.

بەخێر بێی.. ئەی چاودێری ڕەوشت و پارێزەری بەهاکان.

بەخێر بێی.. ئـەی ئاگاداری سـنووری خـودا ﷻ، دوور لە حەرامکراوەکان.

## بەڵێ

بەڵێ.. بۆ زەردەخەنەی جوانت کە پەیامی خۆشەویستی و دۆستایەتییە بۆ بەرانبەرەکەت.

بەڵێ.. بۆ پەیڤە جوانەکانت کە بناغەی هاوڕێیەتییەکی شەرعی دادەنێ و ڕك و کینە ناهێڵێ.

بەڵێ.. بۆ خێر و چاکەیەك کە نەدارێك ئاسوودە بکا، هەژارێك بەختەوەر بکا و برسییەك تێربکا.

بەڵێ.. بۆ کۆڕ و دانیشتن لەگەڵ قورئان چ بە خوێندنەوە و تێڕامان بێ یان کارپێکردنی.

بەڵێ.. بۆ زکری زیاتر و گەڕانەوە بۆ لای خودا ﷻو، بەردەوام بوون لە تکا و تۆبەی ڕاست.

بەڵێ.. بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانت لەسەر ئاین، فێرکردنی سوننەت و، ڕێنوێنیکردنیان لەو شتانەی بێ سوودن.

بەڵێ.. بۆ شەرم و شکۆ و باڵاپۆشی کە خوداﷻ فەرمانی پێکردووە و، سۆنگەی خۆپارێزییە.

بەڵێ.. بۆ هاوڕێیەتی ئەو دەستەخوشکانەی کە لە خوداﷻ دەترسن، خودایان خۆشدەوێ و، ڕێز لە بەها باڵاکان دەگرن.

بەڵێ.. بۆ چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك، سەردانی خزمان، ڕێزگرتن لە دەرودراوسێ و، سەرپەرشتی هەتیوان.

بەڵێ.. بۆ خوێندنەوەی بەسوود، موتاڵای کتێبی باش و بەکەڵك.

## نەخێر..!

نەخێر.. بۆ بەفیڕدانی تەمەنت لەشتی پڕوپوچ، خـــولیای تۆڵە و دەمەقــاڵێ کە هـــیچ خـــێرو خۆشییەکی تێدا نییە.

نەخێر .. بۆ ڕەپێشخستنی پارە و سامان لەسەر تەندروستی و دڵخۆشی و خەو و پشووت.

نەخێر.. بۆ شوێن پێهەڵگرتنی هەڵەی ئەوانی دی، دواتر پاشملە کردنیان و لەبیرکردنی هەڵەی خۆت.

نەخێر .. بۆ فەرامۆشکردنی نەفس لە هەمان کات نەخێر بۆ جێبەجێکردنی هەموو خواست و ویستەکانی نەفس.

نەخێر .. بۆ بەفیڕۆدانی کات و ساتی ژیانت لەگەڵ کەسانی دەست بەتاڵ و بێ ئیش و، بەسەربردنی چەندان کاتژمێر لە یاری و گەپ.

نەخێر .. بۆ پشتگوێخستنی جەستە و ماڵ لە پاکوخاوێنی، بۆنی خۆش و، ڕێککاری.

نەخێر.. بۆ خواردنەوە حەڕامەکان، جگەرە و تلیاك و، هەموو شتە پیسەکان.

نەخێر .. بۆ بە باکردنی کۆنە کای بەڵا و دەردەسەری یان ئەو کارەساتانەی بەسەرچوون یان ئەو هەڵانەی کراون.

نەخێر.. بۆ لەبیرکردنی دوارۆژ و کارکردن بۆی و، بێئاگایی لەو ڕۆژە.

نەخێر .. بۆ بەهەدەردانی ماڵ و سامان لە شتە حەرامەکان، زیادەڕەوی لە سەرفکردنی پارە لە حەڵاڵەکان و کەموکورتی لە خوداپەرستی.

## گوڵ

**گوڵی یەکەم:** لەبیرت بێت خوداﷻ لەو کەسە خۆش دەبێت کە داوای لێخۆش بوون دەکا و، تۆبەی ئەوانە وەردەگرێ کە تۆبە دەکەن.

**گوڵی دووەم:** ئەگەر بەزەییت بە کزۆڵە و بێ دەسەڵاتاندا بێتەوە دڵخۆش دەبیت، باربووی لێقەوماوان بکە خوداﷻ شیفات دەدا، بە ڕك و کینە مەبە تەندروست دەبیت.

**گوڵی سێیەم:** گەشبین بە خوداﷻ لەگەڵتە، فریشتەکان داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەن و بەهەشت چاوەڕێتە.

**گوڵی چوارەم:** سەبارەت بەو گومانە باشەی بە خودات هەیە فرمێسکەکانت بسڕە. لە سۆنگەی ناز و نیعمەتی خودایﷻ، غەم و خەفەتان وەلانێ.

**گوڵی پێنجەم:** گومان مەبە هیچ کەسێك ئەو دونیایەی بە تەواوی هاتبێتە دەست، یەك کەس لەسەر ئەم زەوییەی نەبووە، کە هەموو شتێکی بەدڵی خۆی بۆ بووبێت و لە هەموو دڵگیرییەك سەلامەت بووبێ.

**گوڵی شەشەم:** وەکو بنەدارێکی سەرکەش پتەو بە، خۆ لە ئازاردانێ بەدوور بگرە، خۆ ئەگەر بەردێکیشیان تێگرتی تۆ خورمایان بۆ بەردەوە.

**گوڵی حەوتەم:** ئەرێ قەت بیستووتە بە غەمخواردنێ شتی لەدەست چوو گەڕابێتەوە، یاخود بە خەفەتان هەڵەیەك چا بووبێتەوە، دەی کەوا بێ جەخار و پەژارە لە پێناو چی؟!

**گوڵی هەشتەم:** چاوەڕێی دەردو بەڵایان مەکە، بەڵکو ان شأ الله چاوەڕوانی ئاشتی و بەرقەراری بکە و لەشساغی بکە.

**گوڵی نۆیەم:** ئاگری ڕك و کینە لە سینەی خۆت دامرکێنە بە لێبوردنی هەموو ئەوانەی خراپەیەکیان لەگەڵ کردووی.

**گوڵی دەیەم:** خۆشۆردن، دەستنوێژ، بۆنی خۆش، سیواك و ڕێککاری دەرمانگەلێکی چارەسازن بۆ هەموو وەڕەزی و ناخۆشی و تەنگانەیەك.

## خونچە

**خونچەی یەکەم:** بەوێنەی هەنگ بە کە هەمیشە لەسەر گوڵی بۆنخۆش و لکی تەڕ و بڕ دەنیشێتەوە.

**خونچەی دووەم:** تۆ ئەوندە کاتت نییە بە دوای پەردەلادان لەسەر نەنگی(عیب) خەڵکی بکەوی و هەڵە و کەموکوڕییان کۆبکەیتەوە.

**خونچەی سێیەم:** ئاخەر مادام خودات لەگەڵە لە چی دەترسی؟ ئەگەر خودا ﷻ نەیارت بێ، ئومێدت بە کێیە؟

**خونچەی چوارەم:** ئاگری ئیرەیی جەستەت هەڵدەلوشێ، غیرەی لەڕادەبەدەر ئاگرێکی بەد و بەتاوە.

**خونچەی پێنجەم:** ئەگەر خۆت بۆ ئەمڕۆ ئامادە نەکرد بێ سبەش هی تۆ نییە.

**خونچەی شەشەم:** بەخشپە و بەنەرمۆکەیی لە کۆڕی گاڵتە و مشتومڕ بکشێوە و بڕۆ.

**خونچەی حەوتەم:** بە ڕەوشتی خۆت وا بکە لە ڕەز و باغێك جوانتر بیت.

**خونچەی هەشتەم:** ببەخشە دەبیتە ئاسوودەترین کەس.

**خونچه‌ی نۆیه‌م: واز له‌ خه‌ڵكی بێنه‌ بۆ خوداﷻ، حه‌سوودان به‌ مه‌رگ بسپێره‌ و دوژمن له‌بیر به‌ره‌وه‌.**

**خونچه‌ی ده‌یه‌م: دوای تام و چێژی حه‌ڕام په‌شیمانی و په‌نجه‌گه‌ستن و سزا دێت.**

خشڵ جوانە، جەستە دەڕازێنێتەوە، بەڵام لەوە جوانتر خشڵی ڕۆحە. خشڵی ڕۆح حیکمەتی خودابیە کە بۆ پێغەمبەرانی ناردووە و، لەمەودوا پەیڤگەلی لە نوور کە پڕە لە ئەزموونی دانایان و ئامۆژگاری زانایان و شیعری شاعیران پێشکەشت دەکرێ.

**بریسکە: جگە لە خودا ﷻ هیچ هێز و توانایە نییە. لا حول ولا قوة الا بالله**

## خشڵی یەکەم: ئافرەتێك ئالنگاری (تحدی) ستەم بوو

ئەوەی ڕۆیی ڕۆی و ئەوەی نەهاتووە بەرپیوارە
کەواتە تەنیا ئەو ساتانە هیی تۆیـــە کە تێیدای[1]

**تۆ لە قورئان و فەرموودە بڕوانە دەقەکانی شەریعەت، خودای گەورەﷻ باسی ئافرەتێکی چاکەخوازمان بۆ دەکات و پەسەنی دەدا، خودای گەورەﷻ دەفەرمووێ: [ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلاً لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ] (التحريم :١١)**

**واتە: هەروا خودا نموونەیەکی تری هێنایەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە (بە) ژنی فیرعەون کاتێك کە گوتی: پەروەردگارم لە بەهەشتدا لای خۆت ماڵێکم بۆ دروست بکە و ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەکانی، ڕزگارم بکە لە گەلی ستەمکاران.**

---

(١) ئەم دێرەی بە تۆخی نوسراوە لە سەرەتای هەر بابەتێك، شیعرە.

جوان ڕامێنە چۆن ئاسیا خاتوون(ڕەزای خودای لێ بێ) بووەتە نموونەیەکی زیندوو بۆ بڕواداران، چۆن بووەتە هێمایەکی ئاشکرا بۆ هەموو ئەوانەی دەیانەوێ ڕێنوێنی بکرێن و دەست بە بەرنامەی خوداﷻ بگرن لە ژیاندا، ئای ئەو ئافرەتە چەندە ژیر و تێگەیشتوو بووە، بەجۆرێك دراوسێیەتی خودای ﷻویست! ئاسیا خان دراوسێی پێش خانوو ویست، لە ملکەچکردنی تاوانبارێکی بێڕەزای خودانەناسی وەکو فیرعەون نکوڵی کردووە و ژیانی پڕ چێژ و خزمەت و دەسەڵات و پایە و ڕێز و ڕازاوەی کۆشکی پشت گوێ خست، ماڵێکی چاتر و باشتر و جوانتر و نەبڕاوەی لە نزیکی خوداﷻ داواکرد، لە بەهەشتی نەبڕاوە و لە ڕووباری ساف و تەزیوو لە شوێنێك لە نزیك خودایﷻ پاشا و توانا. ئاسیا ئافرەتێکی زۆر مەزن و گەورە بوو، ئەوەتانێ بە هیممەت و ڕاستی خۆی گەیشتە ئەو ڕادەی وشەی ڕاست و ئیمانی لەکن پیاوە ستەمکارەکەی بدرکێنێ، لەپێناوی خوداﷻ ئازار بدرێ، دواجار دراوسێیەتی خودایﷻ وەگیر کەوت. خوداﷻ ئەو ئافرەتەی کردە پێشەنگ و سەرکردەی هەموو بڕودارێك هەتا ڕۆژی قیامەتێ. لە قورئانیشدا پەسەنی داوە و ناوی تۆمارکردووە و کارەکەی ئەوی بە باش و بەجێ لەقەڵەم داوە، زۆریش سەرزەنشتی پیاوە لادەرەکەی کردووە.

درەوشانەوە: با لەنێو گەردەلولیش بیت هەر گەشبین بە.

ناوبڕ: تەماشا کە ڕۆژاوا چی بە ئافرەت دەکا .. ئافرەتی کردووەتە کەرەستەی یاری!

**بریسکە: لەپاشی هەموو تەنگانەیەك، فەرەحناییەك هەیە.**

## خشڵی دووەم: سامانێکی لەبن نەهاتووت لە ناز و نیعمەت لایە

بامەوداش دوور بێ میهرەبانیی خودا
بـــــەچـــــاوتروکانێك دەتگــــــاتێ

**هۆ خوشکەکەم، لە دوای هەموو ناخۆشییەك، خۆشییەك دێ، لەدوای فرمێسك خەندە دێ و لەدوای شەوی درێژ گزنگی بەیانی هەڵدێ، بەپشتیوانی خودا بەم زووانە تەمتومانی غەم و پەژارە دەرەوێتەوە، ئەوە بزانە تۆ پاداشتت هەیە. ئەگەر دایکی ئەوا لە داهاتوودا ڕۆڵەکانت دەبنە هاوکاری ئیسلام و پەنای ئاینی خودا و پشتیوانی گەل، بەڵام دەبێت تۆ ئەوانت بەباشی پەروەردە کردبێ، ئەو منداڵانە لە سوجدە لە کاتی بەرەبەیانی دوعات بۆ دەکەن، هەر بەڕاستی ئەو نیعمەتێکی گەورەیە تۆ ببیتە دایکێکی بەسۆز و دڵاوا، ئەوە ڕێز و پایەت بەسە کە دایکی پێغەمبەریشﷺ دایکێك بوو، پێغەمبەرێکی ئەوها بەڕێز پێشەوای پێشکەش کرد:**

واهدت بنت وهب للبرایا یدا بیضاء طوقت الرقابا

**واتە: ئامینە خاتوون خەڵاتێکی پێشکەشی ئەو دونیایە کردووە کە دوو دەستی سپی و جوانی لە ملی کۆیلەو دیلەکان کرد.**

بەڵێ تۆش دەتوانی بە پەیڤی جوان و ئامۆژگاری باش، بەلێزانی و گفتوگۆی نەرم و ڕاگۆڕینەوە و ڕێنوێنی و ژیاننامەی بۆندار و بەرنامەی بەرز و شکۆدار، بۆ دەستەخوشکەکانت ببیتە بانگخوازێکی بەرنامەی خودا. ئافرەت دەتوانێ بە ڕەوشت و کردەوەی جوانی خۆی کارێکی وا بکات کە وتار و وانە و کۆڕ ناتوانن بیکەن. چەندان ئافرەت لەو گەڕەکانە هەن کە وانەی ئاین و ڕێز و خۆشەویستی و باڵاپۆشی و ڕەوشتی جوان دەگەیێننە دراوسێکانیان و فێری گوێڕایەڵی هاوسەری خۆیان دەکەن، ژیاننامەی بۆنداری ئەوانە وانەیەکە و دەگوترێتەوە، ئامۆژگارییە و لە کۆڕ و دانیشتنەکان دەماودەم دەکا، ئەم جۆرە ئافرەتانە دەبنە پێشەنگی دەستەخوشکەکانیان.

درەوشانەوە: هەر سبەی ڕەیحان بۆن دەپرژێنێ و زیزی و شپرزەیی دەڕوا و ئارامی باڵدەکێشێ.

ناوبڕ: وشەگەلی (خۆزگە) و (بریا) و (وادەکەم) واز لێ بیهێنە چونکە پێشەکی شکستن.

**بریسکە: بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت.**

## خشڵی سێیەم: ئەوەندەت بەسە موسڵمانی

ئەرێ دەتەوێ لەوە بێئومێد بیت کە دەرووی خێر ببینی ئـــەی بیرناکەیتەوە خـــــودا و قـــەدەر لە کوێن؟!

**بە ئیزنی خودا هەموو ئەو شتانەی لە پێناوی خودا تووشت دەبن تاوانەکانت دەسڕنەوە، با بە فەرموودەیەك موژدەیەکت بدەمێ: ((اذا اطاعت المراءة ربها، وصلت خمسها و حفظت عرضها، دخلت جنة ربها))، واتە: ئەگەر ئافرەت ملکەچی خودا بوو، پێنج نوێژەکەی کرد و ناموسەکەی خۆی پاراست، دەچێتە بەهەشتێ.**

**ئەو کردەوانەش ئەگەر خودا ساناى بکا ئاسانن، ناوی خودای لێ بێنە و ئەو کردەوە باشانە بکە تا بە خودای بەزەیی بگەی و لە دونیا و دوارۆژ کامەران ببیت، با ملت بۆ شمشێری شەرع لە موو باریکتر بێ، لەسەر ڕێبازی قورئان و فەرموودەی خۆشەویستﷺ بڕۆ، ئەوکات تۆ موسڵمانی، ئەمەش ڕێز و پایەیەکی زۆر گەورەیە. سەیری خەڵکی دیکە بکە لە وڵاتی بێباوەڕان لەدایکبوون، جا فەلەن یان جوون یان شوعین یان وڵاتانی تری جیاواز لە ئاینی**

ئیسلام، ئەی تۆ، خودا تۆی هەڵبژاردووە و تۆی کردووەتە موسڵمان. و شوێنکەوتووی پێغەمبەرﷺ، تۆی کردووەتە شوێن پێ هەڵگری عائیشە و خەدیجە و فاتیمە(ڕەزای خودایان لێبێ) ئەی خۆشی لە تۆ کە پێنج نوێژەکە دەکەی و، ڕەمەزانێ بەڕۆژوو دەبیت و، حەجێ دەکەی و، خۆت بە جلك و بەرگی شەرعی دادەپۆشی، سەرفرازی بۆ تۆ کە بە خودا ڕازی و ئیسلامت کردووەتە ئاینی خۆت و بە پێغەمبەرایەتی خۆشەویست ﷺخۆشنودی(رضا).

دەروشانەوە: ئاینەکەت زێڕ و زیوی تۆیە. ڕەوشتەکەت ئارایشت و سامانیشت ئەدەبی تۆیە

ناوبڕ: زینەت و جوانی پەنجەکانت ئەوەیە زکری پێکەی.

**بریسکە: حسبنا الله و نعم الوکیل (پەنــا بە خـــــودا)**

## خشڵی چوارەم: ئافرەتی بڕوادار و بێباوەڕ وەکو یەك نیین

بەختەوەری بەوە بەردەوام نابێت پێی کەیفخۆش بیت بــە غــەم و خەفــەتیش شـــــتی ونبوو نـــاگەڕێتەوە

**دەکرێ هەر بەو شتە خۆت دڵخۆش بکەی کە سەیری دیاردەیەکی ئاشکرا بکەی، ئەویش ئەو واقیعەیە کە ئافرەتی موسڵمان لە وڵاتی ئیسلامییدا هەیەتی و ئەو واقیعەی ئافرەتی بێباوەڕ لە وڵاتی خۆیان هەیانە. خانمی موسڵمان لە وڵاتی ئیسلامییدا، کەسێکی بڕودار، چاکەخواز، ڕۆژووگر، شەوبێدار، باڵاپۆش، گوێڕایەڵی هاوسەری خۆیەتی، لەخودا دەترسێ، چاکە لەگەڵ دەرودراوسێ دەکات و لەگەڵ ڕۆڵەکانی خۆی میهرەبانە یاخوا ئەو پاداشتە گەورەیە و ئەو ئارامی و خۆشنوودیەی پیرۆز بێ، بەڵام لە وڵاتەیلی بێباوەڕان، ئافرەت ڕووت و قووت، نەزان، بێنرخ، جلکوبەرگ پێشان دەدا، کەلوپەلێکی بێبایەخە و شتومەکێکی هەرزانە لە هەموو شوێنێ پیشان دەدرێ، نە نرخی هەیە نە ڕێز و پایە و ئاین، تۆ بەراوردی ئەو دوو وێنە و دیاردەیە بکە، ئەوجا بۆت ڕوون دەبێتەوە بەڵێ، ئەوە تۆ بەختەوەرتر و باڵاتر و گەورەتری، الحمدلله:[ وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَنْتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ] (آل‌عمران :١٣٩)**

سست و دڵ لاواز مەبن و غەمبار مەبن هەر ئێوە بەرز و بڵندترن ئەگەر بڕوادار بن.

درەوشانەوە: هەموو خەڵك هەر دەژیین ئەوەی کۆشکێکی هەیە و ئەوەی کۆڵیتێکی هەیە، بەڵام ئەوەی گرنگە بزانی کامەیان دڵخۆشن.

ناوبڕ: گەنجی بەرەو پیری، جوانی بەرەو کرێتی، لەخوداترسانیش بەرەو بردنەوە.

**بریسکە: هەر خودا..هەر خوداپەروەردگارمە و هاوەڵی نییە**

## خشڵی پێنجەم: تەمبەڵی دۆستی شکست و ڕووخانە

باڵاترین شوێن لەم دونیایە سـەر زینی ئەسپە
باشترین هاونشین لە هەموو سەردەمێك کتێبە.

**ئامۆژگارییت دەکەم خۆت بە کارێك مژۆڵ بکە، واز لە سستی و لاوازی و دەست بەتاڵی بێنە، هەڵسە سەر پا و دەستێك بە ماڵ و کتێبخانەکەت دابێنە، یان ئەرکەکانت ڕاپەڕێنە یان نوێژێك بکە، قورئان یاخود هەر کتێبێکی تری بەسوود بخوێنە یاخود گوێ بدە شریتێکی بەکەڵك، لەگەڵ دۆست و دراوسێ دانیشە، بابەتێکی وا باس بکەن لە خوداتان نزیك بکاتەوە، ئا لەو دەمەیدا شادی و کامەرانی و سینەکراوەیت دەست دەکەوێ - بە ئیزنی خودا - وریا بە ... تکایە وریا بە خۆت نەدەیتە دەست بێکاری و تەوەزەلی، چونکە هەرچی پەژارە و ناخۆشی و ڕاڕایی و گومان و پەستی هەیە لەسەرت خڕدەکاتەوە، بە کار و سەرقاڵی نەبێ ناڕوا.**

**ئەوەشت بیرنەچێ بایەخ بە سەر و سیمات بدە، هەر لە ڕووکاری دەرەوە و بۆنخۆشی ماڵ و ڕێکوپێکی لە کۆڕ و دانیشتندا، بەڕووخۆشی و سینەفراوانی لە مێرد و منداڵ و برا و خزم و دۆستەکانت بڕوانە.**

زینهار خۆ لە تاوانان بپارێزە چونکە هۆی پەستی و ناڕەحەتیین بەتایبەتیش ئەو گوناهانەی لای ئافرەتان باوە وەکو ڕوانینی حەڕام و خۆڕووتکردنەوە و دانیشتن لەگەڵ بێگانان و نەفرەت و جنێو و پاشملە یان گوێنەدان بە مافی هاوسەر و دەرکنەکردن بە کردەوەی باشی هاوسەر، ئەو گوناهانە لەنێو چینی ئافرەتان زۆرن، جگە لەوانەی خودا ڕەحمی پێکردوون. وریا بە وەبەر توڕەیی خودا ـ جل فی علاه ـ نەکەوی، خۆبپارێزە و لە خودا بترسێ چونکە خۆپارێزی و لە خوداترسان دەبێتە هۆی دڵخۆش بوون و ئاسوودەیی ویژدانت.

**درەوشانەوە:** ئەگەر غەم ڕووی تێکردی و زۆر خەفەتبار و دڵگیر بووی، بڵێ: لا اله الا الله

**ناوبڕ:** لەبیرت بێت تۆ لەسەر سەفەری و توێشووت ئامادە کە.

**بریسکە: بەجوانـی دان بەخۆدا بگرە**

## خشڵی شەشەم: بەو شتانەی تۆ هەتە لە ملیۆنان ئافرەت باشتری

کەســـانی وا هـــەن تۆ دەرگـات بە ڕوو داخستوون
کەچی هەر ئەوانە بوون تاڵترین ژیانیان لەگەڵت گوزەراند

**بە چاوێکی گشتگیر لە دونیایێ بڕوانە، ئەو نەخۆشخانانە بە هەزاری نەخۆشی وای تێدایە کە سەبارەت بە نەساغی و ئازار چەند ساڵە دەتلێنەوە. سەرێ چەند ساڵانە تووشی کارەسات بووینە، ئەرێ هەزاران کەس لە پشت تێل و شیشەی زیندانێ نیین؟ ژیانیان تاریك و لێڵ بووە و هەرچی خۆشییە نیانە، ئاخۆ چەندان کەس لەژێر چاودێری چڕ یان لە نەخۆشخانەن و عەقڵییان لە دەست داوە و فکریان نەماوە و شێت و شور بووینە. ئەدی ئەو هەموو خەڵکە هەژار و نەدارە لەژێر چادری تەسك و تریسك و کونە کۆڵیتان نیین و، پارچەیەك نانیان دەست ناکەوێ. لەم دونیایەدا چەندان ئافرەت هەن بە کارەساتێك یان ڕووداوێك هەموو منداڵەکانیان تێداچوون و مردن؟ یاخود ئافرەتی وا هەیە بینایی یان بیستنی لەدەست داوە یا قاچی بڕاوەتەوە یاخود دەستێکی پەڕیووە، یان فکر و هۆشی نەماوە یاخود دووچاری نەخۆشی درێژخایەنی وەکو شێرپەنجە یان نەخۆشی دی بووە، تۆش ساغ و سەلامەتی و لە خێر و خۆشی**

و ئاسوودەیی و ئارامی و دڵنیایی دایت، بۆیە لەسەر ئەو ناز و نیعمەتانە سوپاسی خودای بکە و کاتی خۆت لەو شتۆکانە بەسەر مەبە کە خودا پێی ڕازی نییە وەکو: دانیشتنی دوور و درێژ لە دیار کەناڵی ئاسمانی کە ڕێگەپێنەدراو و خراپ و بێکەڵکن، تەنیا کات دەکوژن. سەیرکردنی ئەو کەناڵانە تەنیا دەردو نەخۆشی و تەمبەڵی و سستیت تووش دەکەن، کەوابێ تۆ گرنگی بە شتی بەمەفا و باش بدە، وەکو کۆڕو کۆبوونەوە یان بەرنامەی تەندروستی بەسوود یان هەواڵی پێوەندیدار بە موسڵمانان یان شتی لەم جۆرە، خۆ لەم شتە بێکەڵك و قۆڕانە بەدوور بگرە کە پیشان دەدرێن، ئەو شتانە شەرم و ئاغری و ئاین لەبەین دەبەن.

درەوشانەوە: لە ستەمکار گەڕێ بۆ دادگەی ڕۆژی دوایی، لەوێندەر جگە لە خودا هیچ دادوەرێك نییە.

ناوبڕ: هەوڵ و هیممەتت لە چاکەخوازی و خۆشەویستی بە دەردەکەوێ.

**بریسکە: لە ساتێکەوە بەرەو ساتی خۆشی**

## خشڵی حەوتەم: بۆ خۆت
## لە بەهەشت کۆشکێك بنیات بنێ

گوێ لە مستی ویست و ئارەزووەکانی خۆم بووم و بوومە کۆیلە
ئەگـــەر قــەنـاعـــەتم هــەبـــوایە ئـــازاد بـــووم

**دە تۆ تەماشا کە چەندان نەوە هاتن و ڕۆیشتن، ئەرێ چ ماڵ و موڵکیان دەگەڵ خۆ برد؟ چ کۆشك و تەلار یان پلەو پایەییان برد؟ چ زێڕ و زیوەریان لەگەڵ نێژرا؟ تاوێ چوونە ئەو دونیا چ ئۆتۆمۆبێل یان فڕۆکەیان برد؟ نەوەڵا تەنانەت جلك و بەرگیشیان لەبەرداکەندن، بەتای کفنێك شۆڕی گۆڕیان کردنەوە، ئینجا لە مردوو دەپرسرێ خودات کێیە؟ پێغەمبەرت کێیە؟ و لەسەر کام ئاین بووی؟ خۆت بۆ ئەو ڕۆژە ساز وئامادە کە، بۆ موڵك و ماڵی دونیایێ غەمان هەڵمەگرە، چ بە غەمان پێکنایێ، ماڵی دونیا چڵکی دەستە جگە لە کارو کردەوەی چاك هیچت بۆ نامێنێتەوە، خودای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: [مَنْ عَمِلَ صَالِحًا مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ (النحل :٩٧)]**

**واتە: هەر کەس لەنێر یان لە مێ کردەوەی چاکی کردبێ و بڕواداریش بوو بێت ئەوە سوێند بەخودا بە ژیانێکی خۆش دەیان**

ژیێنین، سوێند بێ بە چاکتر لەوەی کە ئەوان دەیانکرد پاداشتیان دەدەینەوە.

درەوشانەوە: نەخۆشی پەیامێکە و موژدەیەکی لە خۆ گرتووە، لەشساغی بەرگێکە نرخی تایبەتی خۆی هەیە.

ناوبڕ: لەبیرت بیت خودات لەگەڵە کەوابێ لە چی دەترسی؟

بریسکە: ئەی پاك و بێگەردی بۆ تۆ، چ خودایەکی بەڕاستی جگە لە تۆ نییە، من لە ستەمکاران نەبم.

## خشڵی هەشتەم: بە دەستی خۆت دڵت هەلا هەلا مەکە

لە هەموو ئەو شتانە خۆ بە دوور بگرە کە کاتت لێ دەکوژن، هەر لە خوێندنەوە و سەیرکردنی گۆڤاری بێئابڕوو و، پڕ وێنەی ڕووت و هەڵهاڵدراو و بیری خراپ، یا کتێبی توندوتیژی یان ڕۆمانی دژەڕەوشت. بەڵام ئاگات لەو شتە بەسوود و بەکەڵکانە بێ بۆ نموونە گۆڤاری ئیسلامی و کتێبی بەمەفا، خولی گەشەپێدان و، ئەو وتارانەی لە هەردوو دونیا بەهرەی لێ دەبەی. هەندێ کتێب و وتار گومان لە دڵ و دەروون دروست دەکەن و، دوودڵی و لادان لە ناخ پەیدا دەکەن. ئەو دەرئەنجامە بەهۆی کاریگەری ڕۆشەنبیری بێجێ و لادراوی وڵاتانی بێباوەڕ بۆ وڵاتانی ئێمە هاتووە و بڵاوبووەتەوە.

بزانە کلیلی ڕاز و نهێنییەکان لای خودایە و بەس، هەر بەخۆی غەم و خەفەتان لادەبا بۆیە لە تکا و نزا هەتەر بەو بەبەردەوامی ئەم دوعایە بڵێرەوە: ((اللهم إني أعوذ بك من الهم و الحزن، و اعوذ بك

من العجز والكسل، و اعوذ بك من البخل والجبن، و اعوذ بك من غلبة الدين، وقهر الرجال))

**واتە: ئەی خوایە، لە غەم و خەفەت پەنات پێ دەگرم، پەنات پێ دەگرم لە سستی و تەمبەڵی، پەنات پێ دەگرم لە ڕژدی و ترسنۆکی، پەنات پێ دەگرم لە کەوتنە بن باری قەرز و قۆڵ و تورەیی مەردان.**

**ئەگەر ئەم فەرموودەیەت زۆر پاتە کردەوە و لە ماناکەشی ڕامای، ئــەوا خودا هەرچی پەژارە و ناخۆشی و ئازارە لەسەرت لادەبا.**

**درەوشانەوە: لە هــەر چرکەیەم تەسبیحاتێك بکەو، لە هەر خولەکێك بیرۆکەیەکت هەبێت و لە هەر کاتژمێرێك کردەوەیەك بکە.**

**ناوبڕ: فرمێســـــکی چاوی تۆبەکارێك لە ســـــەد ڕکات نوێژی خۆپەسەندێك چاترە.**

بریسکە: أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ (النمل :٦٢)

ئایا زاتێ کە بە هاواری ناچارو داماوەوە دێت کاتێ هاواری لێ دەکات و ناخۆشی و بەڵاکان لادەبات و دەتان کاتە جێنشینی گەلانی تری سەر زەوی ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەل خودادا (نەخێر نی یە) بەڵام زۆر کەم بیردەکەنەوە.

## خشڵی نۆیەم: تۆ مامەڵە لەگەڵ خودایەکی بەخشندە و دەستکراوە مامەڵە دەکەی

زەمانە، دوای کات و ساتێکی زۆری دووری و دابڕان بـــــەیـــەکدیمــــــان دەگـــــــــەنێتـــەوە

**موژدەی خۆش بدە، ئەوەتانێ خودا چ پاداشتێکی گەورەی بۆ داناوی، هەر بەخۆی دەفەرمووێ:**

[فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى ] (آل‌عمران :١٩٥) ئینجا پەروەردگاریان وەڵامی(نزاکانی) دانەوە (فەرمووی) بێگومان من کردەوەی (هیچ) خاوەن کردەوەیەك لە ئێوە لە نێر یان مێ زایە ناکەم). خودا چ گفت و هەرێیەکی بە پیاو دابێ هەمان گفتی بە ئافرەتانیش داوە، چۆن بە پیاوانی هەڵداوە، بەهەمان شێوە بە ئافرەتانیشی هەڵگوتووە، ئەوەتا دەفەرمووێ:[إِنَّ

الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا] (الأحزاب :٣٥)

واتە: بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسوڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیمان دار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشەندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاك و ئەو پیاو و ئافرەتانەی کە زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێ بوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوو بۆ ئامادەکراوە (هەر کە دنیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن).

ئەو ئایەتە بەڵگەی ئەوەیە تۆی ئافرەت خوشك و نزیکی پیاوی، پاداشتت لای خودا پارێزراوە، تۆش لە نێو ماڵ و کۆمەڵگادا کردەوەی چاکت هەیە کە دەتگەیێنێتە ڕەزامەندی خودا و ببتە چاکترین نمونە، بۆ ڕۆڵەکانت ببیتە چرا و نمونەیەك کە شانازییت پێوەبکەن. با پێشەنگی تۆ لە ژیانتدا ئاسیای خێزانی فیرعەون و مەریەم و خەدیجە و ئەسما و فاتیمە بێ( ڕەزای خودایان لێبی). ئەوانە و هاوشێوەکانیان هەڵبژێردراوی پاك و بڕوادار و خوداناس و ڕۆژووگرن، خودا لەوان ڕازی بوو ئەوانیش لە خودای ڕازی بوون، دە تۆش لەسەر ئەم ڕێبازە بەو ژیاننامەی ئەو پێشەوایانە بخوێنەوە

**هەتا خێر و ئاسوودەییت و بە چەنگ کەوێ.**

**درەوشانەوە: فرمێسکی چاوی هەتیوان بسڕە با بە ڕەزامەندی خودای شاد بی و بچییتە بەهەشتێ.**

**ئاوبڕ: ئوم مەحجەن گەسکی لە مزگەوتێ دەدا، پاداشتی خۆی لە بەهەشتێ وەرگرت.**

**بریسکە: ئەرێ بەیانی زوو نییە؟**

## خشڵی دەیەم: بە هەر شێوەیەك بێت هەر تۆ براوەی

بەو کەسەی نەنگیمان لێ دەگـــرێ بڵێ:
ئەرێ زەمانە هەر تەنیا مەردەکان تاقی ناکاتەوە؟!

**خۆڕاگر بە، ئەوەی بزانە ئەگەر تووشی غەم و خەفەتێك یان سفت و سۆیەك بووی ئەوا دەبنە هۆی ڕەش بوونەوەی تاوانەکانت، بزانە ئەگەر یەکێ لە منداڵەکانت مرد ئەوا لای خودا دەبێتە تکاکارت، بزانە ئەگەر دووچاری نەخۆشییەك یان پەتایەك بووی ئەوا لای خودا پاداشت وەردەگریت، ئەو نەساغییە لای خودا پارێزراوت دەکا، لای خودا برسیەتی پاداشتی خۆی هەیە، نەخۆشی پاداشتی خۆی هەیە، هەژاری پاداشتی خۆی هەیە، هیچ شتێ لای خودا زایە نابێ، خودا ئەم شتانە وەکو بارمتە هەڵدەگرێ هەتا لە ڕۆژی دوایی دەدرێتەوە خاوەنەکەی.**

**درەوشانەوە: نوێژ دەستەبەری دڵکرانەوە دەکات و غەمان فڕێ دەداتە دەرێ.**

**ناوبڕ: ڕاستکردنەوەی هەڵە شانازی و شکۆیە، بەڵام بەردەوام بوون لەسەری فەوتانە.**

گەردانە بەنرخ و گرانبەهایە، وەلێ لە گەردانە گرانتر و لە ملوانکە بەنرختر ئەو گفت و پەیمانەیە کە لە نێوان خودا و بەندە دایە، پەیمانی شەڕەفە، بەرنامەی خەڵکە، دەستووری ژیانە، سوور بە لەسەر وەفاداری بۆ ئەو پەیمانە، ئەوجا لە بەهەشتێ ملوانکەی بەنرختر و جوانتر لە مل دەکەی.

**بریسـکە: ئەوەی پێم بەخشـیوی توند دەسـتی پێوە بگرەو لە سوپاسگوزاران بە.**

## گەردانەی یەکەم: بەخششەکانی خودای ئەژمار بکە

مـــن تـــا ئەو ڕادەیە ئومێدم بە خـــودا هەیە
کە ئەوەی لەلای خوداوە دێ ئارامی لەسەر دەگرم

**کە بەیانی دادێ ئەوەت لەبیر بێت ڕۆژ لەسەر هەزاران ئافرەتی بەدبەخت و بێچارە هەڵدێ و، جەنابیشت لە نێو ناز و نیعمەتان دای، هەزاران برسی ڕۆژ دەکەنەوە و تۆش تێروپڕی، ڕۆژ لە هەزاران کڵۆڵ و بەندە هەڵدێ و تۆش سەرگەڤاز و ئازادی، هەزاران کەسەردار و جەرگ سووتاو هەن و تۆش کەیفخۆش و سەلامەتی، فرمێسك لەسەر گۆنای ئافرەتان شۆڕابەی دەبەستن و چەند جەخار لە دڵی دایکان دایە، چەند زیرە و ناڵە و نوزە لە قوڕگی کچۆڵان پەنگی خواردووەتەوە کەچی تۆش ساز و پۆشتەی، دەی کەوابێت لەسەر ئەو پارێزکاری و سۆز و بەزەییە سوپاسی خودای بکە.**

**بەڕاشکاویی لەگەڵ خۆت دانیشە و، ژمارە و ئامار بەکاربێنە: چەندت کەلوپەل و پارە و سامان و نیعمەت و شتی خۆش و شادیبەخش هەیە، ئەی جوانی و ماڵ و منداڵ و تاو و ساو و وڵات**

و ڕۆناکی و هەوا و ئاو و خواردن و دەرمان، دەی دڵخۆش بە، سینەفراوان و شادمان بە.

**درەوشانەوە:** بە پارەی خۆت نزا و پاڕانەوەی هەژاران و خۆشەویستی نەداران بکڕە.

**ناوبڕ:** جوانترین شت لە ژوورەکەتدا بەرماڵ و قورئانەکەتە.

**بریسکە: بە بەشی خۆت ڕازی بە دەبیتە دەوڵەمەندترین کەس**

## گەردانەی دووەم: ئەو کەمە شتەی دڵخۆشت دەکا زۆر چاترە لەو زۆرەی تووشی گەرداوێکت دەکا

خـــودا ئەگـــەر بیەوێ خێر و چـاکەیەك بڵاوبکاتەوە، پەنهانی دەکا، ئەوسا زمانی حەسوودان دنیای تێدەگەێینن

**ئەو تەمەنەی بۆت ئەژمێر دەکرێ بریتییە: لەو تەمەنەی کە لە خۆشی و شادی و ڕەزامەندی و ئاسوودەیی و پەسەندی گوزەراندووتە، لێ چاوبرسییەتی و نەوسنی و ویستی زۆر کەی لە تەمەنت حیسابن!؟ ئەم شتانە دژی تەندروستی و لەشساغی و جوانی تۆن، کەوا بێ ئاگات لە ڕەزامەندی خودا بێ، بە بەشی خۆت لاس وەربگرە، بڕوات بە قەزا و قەدەر بێ، بۆ داهاتوو گەشبین بە، بە وێنەی پەپولەیەکی ڕۆح سووك و دیمەن جوان بە، هێندە خۆت پێوەستی شتان مەکە، لەم گوڵ بۆ ئەو گوڵ، لەو گرد بۆ ئەم گرد، لەو مێرگ بۆ ئەو مێرگ بفڕە، ئەگەرنا وەکو مێشەنگ بە، لە تەڕی دەخوا و پاکی بەرهەم دێنێ، کاتێك لەسەر لکە دارێك دەکەوێ چ جێی ناشکێ، گوڵان ڕادەموسێ و ناگەزێ، هەنگوین دەدا و پێوە نادا، بە عیشقەوە دەفڕێ، بە ئازیزی دەنیشێتەوە، گیزەگیزەکەی موژدەیە، نوزەی**

ڕەزامەندییە، هەر دەڵێی ئافەریدەیەکی ئاسمانییە و لە جیهانی جاویدانی دابەزیووە.

درەوشانەوە: خودا تۆبەکارانی خۆش دەوێ چونکە ئەوان بۆ لای ئەو گەڕاونەتەوە و سکاڵای خۆیان بۆ ئەو بردووە.

ناوبڕ: سوجدەیەکی دوور و درێژ و ملکەچانە زۆر زۆر لە تەلاری بە گوڵان چاترە.

**بریسکە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی غەم و خەفەتی لەسەر لابردم**

## گەردانەی سێیەم: تۆ بڕوانە هەور، هەرگیز مەڕوانە تۆز و خۆڵ

ئەگەر کڵپەی ئاگر نەبوایە کوا
دەزاندرا بـــۆنی عود خۆشە!

**هیممەتت هەبێ و بەرز بڕوانە، داوات لێ دەکەم هەمیشە بەرەو بەرزی بڕۆی، بەردەوام بە و ئاگات لە کەوتن و نسکۆش بێ، ئەوەی بزانە ژیان خولەك و چرکەیە بۆیە وەکو مێرووله بە لە ڕووی کۆشان و نەسرەوتن و ئارامگرتن، هەردەم تێکۆشە، ئەگەر چوویەوە سەر گوناهان دیسان تۆبە بکە و پەشیمان ببەوە، قورئان ئەزبەر کە، ئەگەر لەبیرت کرد قەیدێ ناکا هەمدیس بۆ جاری دووەم و سێیەم ... و دەیەم بگەڕێوە سەری. ئەوە گرنگە هەست بە شکست و کەوتن نەکەی، چونکە مێروو پەیڤی کۆتایی نازانێ و عەقڵیش دان بە کۆتا جار نانێ، بەڵکو لە هەموو بارێك هەوڵ و چاککردنەوە هەیە، تەمەنیش وەکو جەستە وایە دەگونجێ نەشتەرگەری جوانکاری بۆ بکرێ تەمەن ڕێك وەکو باڵەخانەیە دەشێ بڕووخێندرێ و سەر لە نوێ بنیات بندرێتەوە. ئەم جارە بە جوانی و بە بۆیەی دیکە بڕازێندرێتەوە، ئامانە خۆ لە نسکۆ و تێکشکان بەدوور بگرە، لە**

زەینی خۆت پێشبینی نەخۆشی و کارەسات و چەرمەسەری و بەڵای ناگەهان بسڕەوە، خوداش دەفەرمووێ: [وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ] (المائدة :٢٣)

واتە: ئەگەر ئێوە باوەڕدارن هەر پشت بەخودا ببەستن.

درەوشانەوە: وازهێنان لە سەرپێچی و گوناهـ جیهادە، بەردەوام بوونیش لەسەر تاوان کەللەڕەقی و لاسارییە.

ناوبڕ: پێش گوتنێ چاك بیرکەوە، نەوەك پەیڤەکەت کوشندە بێ.

**بریسکە: موژدە بدەنە ئەوانەی بڕوایان هێناوە.**

## گەردانەی چوارەم: کەپرێکی تژی لە بڕوا لە تەلارێکی پڕ جەور و ستەم چاکترە

ئەو کەســــەی چاوی پێم هەڵنایێ لۆمــەی ناکەم
گەر ڕکی لێم بێتەوە، چونکە من سزا و ئازارم بۆ ئەوان

**ئافرەتێکی موسڵمان کە لە ساباتێك دەژییَ و خوداپەرستی دەکا و پێنج نوێژەی ناچێ و یەك ڕۆژووی ڕەمەزانێ ناشکێنێ زۆر لەو ئافرەتە بەختەوەرترە کە لە کۆشێکدا لە نێو کەنیزەك و خزمەتکار و کەلوپەل و داروبار دایە، خوشکێکی بڕوادار لە ڕەشماڵێك دابێ و کەرتە نانێکی جۆ، چۆڕە ئاوێکی گۆزە، قورئانێك و تەسبێحێکی هەبێ گەلێك لەو ژنە شادترە کە لە بورجی عاج یان لە ژووری ڕازاوە دەژییَ، نە خودا دەناسێ نە یادێکی حەق تەعالا دەکا و نە ڕێی پێغەمبەرﷺ دەگرێ. دەی کەوابێ لە مانای دڵخۆشی تێبگە، دڵخۆشی ئەو شت سەختە نییە کە زۆر کەس وا بۆی چوون، پێیان وایە لە دۆلاڕ و دینار و درهەم و ڕیاڵ، ڕایەخ و جل و جۆڕ و نان و پات و خواردنەوە و پێڕۆ دایە، نەك جارێك هەزار جار نەخێر، بەختەوەری بریتیە لە قاییلبوونی دڵ و ئاسوودەیی ویژدان و بەرقەراری دەروون و شادمانی ڕۆح و**

سینەفراوانی و چاکی حاڵ و بەردەوام بوون لەسەر ئاکاری باش و پاککردنەوەی کردەوەت و قەناعەت و ڕازی بوون بە بەشی خۆت.

درەوشانەوە: ئەو کەسە چۆن ئاسوودە دەبێ کە ئازاری موسڵمانێکی داوە یان ستەمی لە بەندەیەك کردووە.

ناوبڕ: ڕەنگە سبەی بێت و ئێمە لە دونیاکەی تر بین!

**بریسکە: پشت بە (خودای) زیندوو ببەستە کە زاتێکە هەرگیز نامرێت.**

## گەردانەی پێنجەم: کاتەکانت بەگوێرەی ئەرکەکانت دابەش بکە

ئەوە خودایە، بەڵکو ئەو غەمەی شەوت پێکردەوە دەروێـــکی خـێری بـــەدواوە بـــێت.

**دە تۆ خوێندنەوەی کتێبێکی بەسوود یان شریتێکی باش تاقیبکەوە، بەجوانی گوێ بدە ئایەتەکانی قورئانێ، لەوانەیە تاکە ئایەتێك هەموو گیانت بلەرزێنێ و، بەنێو خۆتدا نغرۆت بکا و، لەگەڵ ویژدانت بدوێ، هەر ئەو ئایەتە ڕێنوێنی و نوور بێ، هەرچی نائومێدی و گومان و دوودڵی و بێ هیوایی هەیە بیبا، موتاڵای کتێبەکانی فەرمووده بکە و لە کتێبی (ریاض الصالحین) فەرمایشتی خۆشەویست ﷺ بخوێنەوە، هەتا چارەی باش و زانیاری بەسوودت دەست کەوێ، کە لە هەڵخلیسکان بتپارێزێ و لە کەمایەسی بەدوورت بگرێ و، شیفای زامانت بدا. بەڵێ، دەرمانی تۆ لە سروشە(وحی) بە قورئان و سونەتەوە، سانەوەی تۆ لە باوەڕەکەتە، نوێژ گلێنەی چاوتە، سەلامەتی دڵت لە ڕازی بوونە، قەناعەت مایەی هێوری هەست و دەروونتە و، جوانی ڕوخسارت لە خەندەی لێوانە، باڵاپۆشیی پارێزی ناموستە، دڵنیایی دڵ و دەروونت لە زیکر و یادی خودایە.**

درەوشانەوە: لە تکا و تووکی ستەملێکراوان و فرمێسکی بێبەشان پارێزی بکە.

ناوبڕ: یێش خوێندنەوەی کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە قورئان بخوێنە.

**بریسکە: تا خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لە دەستتان چووە و دڵخۆش و غەڕا نەبن بەوەی کە پێ ی داوون**

## گەردانەی شەشەم: بەختەوەری ئێمە وەکو هی ئەوان نییە

پـــــاشی نەخۆشییان، نەساغ چـــادەبنەوە
غەریبیش دوای ماوەیەك بەدیاردەکەونەوە

**ئەوە کێ پێی گوتی: میوزیکی ڕابواردنێ و، گۆرانی هەڵیت و پەڵیت و، زنجیرە فیلمی ڕوخێنەر و، شانۆگەری پڕوپوچ و، گۆڤاری بێئاوڕو و، فیلمی ڕووشێنەر، بەختەوەری و شادمانیت بۆ دێنن؟ ئەوەی ئەم شەکرەی شکاندووە با لە گوپی دا..! ئەم هۆگەلە کلیلی بەدبەختی و سۆنگەی غەمۆکی و، دەرگای خەفەت و دڵتەنگی و پەژارەن، ئەوەش بەدانپێدانانی ئەو کەسانەی کە ئەزمونیان کردووە و، دوای زانیین تۆبەیان کردووە. لەو ژیانە ناخۆش و ناڕێکە ڕاکە، ژیانی ئەو کەسانەی هیچ و پوچ و لادەرن و ڕێی خودایان ون کردووە، ڕووبکەرە قورئان خوێندنی گەردەنکەچانە، خوێندنەوەی بەسوود، ئامۆژگاری بەپێز، وتاری بەجۆش و خرۆش، خێری بە چەندانە و تۆبەیەکی ڕاستگۆیانە. دە وەرە بۆ کۆڕ و دانیشتنی ڕۆحانی و زیکری خودا، بەڵکو خودا تۆبەت لێ وەردەگرێ و، دڵت پڕ پڕ دەکا لە ئارامی و بەرقەراری و دڵنیایی.**

**درەوشانەوە: لە دڵێکی پاك و بێگەرد هاوبەش دانان و گزی و ڕك و ئیرەیی بوونی نییە.**

**ناوبڕ: کێشە لەوەیە ئەو زێڕ و زیوە لەگەڵ ئافرەت ناچنە نێو گۆڕ!**

**بریسکە: خودایە دڵ و دەروونم فراوان بکە**

## گەردانەی حەوتەم: سواری کەشتی دەربازبوون بە

ئەی خودای بونەوەر خۆمان ڕادەستی تۆ کردووە بەو ئومێدەی
تۆش بەزەییت بە کەمدەستاندا بێتەوە ئای چــــەند بە ڕەحمی.

**بەدەیان چیرۆك و بەسەرهاتی هونەرمەندان و پیاوخراپان و گاڵتەچی و پووچگەر و ئەوانەی ڕادەبووێرن، بەمردوو و بە زیندووەوە خوێندووەتەوە، گوتومە: ئەی داد، موسڵمان و بڕوادار و ڕاستبێژ و ڕۆژووگر و خوداناس و خوداپەرست وملکەچان لە کوێن؟ ئەم تەمەنە کورت و سنووردارە کەی بایی ئەوە دەکا بەم شێوەیە لە شتی پڕوپووچ و لاوەکی بەسەری ببەی و لە مەیدانی فەرامۆشی و سەرپێچی بە هەدەری بدەی؟ ئەرێ جگە لەو تەمەنە چ تەمەنی دیکەت هەیە؟بێجگە لەو ڕۆژگارەی تێیدای هیچ ڕۆژگاری دیت هەیە؟ ئایا هیچ گفتێکت لە خودا وەرگرتووە کە تۆ نامری؟ ... نەوەڵا نییە ئەو شتانە هەمووی وەهم و گومانی ناڕاستن، ئەندێشەی بەتاڵن، دەی کەوابێ لە خۆت بپێچەوە، ڕەوتەکەت نوێ بکەوە و، پشت لەخراپە کە و، خۆت بگەیێنە کاروانەکە و، سواری کەشتی ڕزگاری بە.**

درەوشانەوە: ئافرەتی ژێر بیابانێکی قاقڕ دەکاتە مێرگێکی سەوز.

ناوبڕ: هەندێ پارە بۆ ڕۆژی ڕەش لە بانکی پاداشت دابنێ.

**بریسکە: دەرووی خێر لە دوای ناخۆشییە.**

## گەردانەی هەشتەم: کڕنووش کلیلی بەختەوەرییە

بەختەوەرییم لە کۆکردنەوەی ماڵ و سامان نەدیت
بەڵکو تەنیا لەخوداترسان کامەرانن.

**یەکەمین لاپەڕەی تێنووسی ئەمڕۆ و یەکەم پلیتی تۆماری ئەمڕۆت نوێژی بەیانییە، ئەمڕۆت بەنوێژی بەیانی دەست پێ بکە، ڕۆژی ئەمڕۆت بە نوێژی بەیانی بکەوە ئیدی دەکەویتە نێو دەستەبەر و پەیمان و پارێز و چاودێری و ئارامی خودا، ئەوسا خودا لە هەموو ناحەزییەك دەتپارێزێ و بەرەو خێروبێرت دەبا، هەرچی باس و چاکەیە پیشانت دەدا و لە هەموو خراپەیەك دوورت دەخاتەوە. ئەو ڕۆژەی بە نوێژی بەیانی دەستت پێنەکردبێ هیچ خێروبێری تێدا نییە. ئەوڕۆژەی نوێژی بەیانیت چووبێ هیچ خۆشی تێدا نییە، ئەم نوێژە یەکەم نیشانەی قەبوڵ بوون و ناونیشان کتێبی ڕزگاری و تابلۆی سەرکەوتن و سەربەرزی و سەرکەوتنە. ئەی ئەو کەسەی نوێژی بەیانیت کردووە خۆشی لە خۆت، شادی بۆ جەنابت کە نوێژی خۆت کردووە، چاوی ئەو کەسە ڕۆشن کە ئاگای لە نوێژی بەیانییە، بەدبەحتی و ماڵوێرانی و ژیڤانی بۆ ئەوانەی ئەم نوێژە پشت گوێ دەخەن.**

درەوشانەوە: مشتومڕی بێ ئەنجام و دەمەقاڵەی بەتاڵ هەرچی باش وجوان هەیە، نایهێڵێ.

ناوبڕ: ببە هۆی بەردەوامی بۆ خاوخێزانت.

**بریسکە: ئایا ئێمە تۆمان سینەفرەهـ نەکرد**

## گەردانەی نۆیەم:
## پیرەژنەی لێك دەبنە دروشم

لە کاتی نائومێدی پشتیوانی دێ
خودای بەزەیی و فەریادڕەس دێتە هانات

**تۆ وەکو ئەو ئافرەتە بە کە ئەوێ ڕۆژێ لای حەجاج بوو، متمانەی بە خودا پتەو بوو، ڕۆژێك حەجاج کوڕی ئەو پیرێژنەی لە زیندانێ پەستا و سوێندی بۆ پیرەژنە خوارد کوڕەکەی بکوژێ، پیرەژنەش بەسەربەرزی و ئازایی و باوەڕو خۆڕاگرییەوە لە حەجاجی چووە پێش و گوتی: کوڕە ئەگەر نەشیکوژی خۆ هەر دەمرێ!**

**لە پشت بەستن بە خودا وەکو پیرەژنە فارسەکە بە وەختایەك لە کۆڵیتی مریشکان دوورکەوت بووەوە و، چاوێکی لەئاسمانێ بڕی و گوتی: خودایە کۆڵیتێ مریشکانم بپارێزە هەر بەخۆت چاکترین پارێزەری!**

**لە خۆڕاگری وەکو ئەسمای کچی ئەبوبەکر بە، تاوێك عەبدولای کوڕی بە کوژراوی و هەڵواسراوی بینی، ئەم پەیڤە بەناوبانگەی گوت: ئەرێ کوا ئێستا کاتی ئەوەیە ئەم شۆڕەسوارە بگلێ؟! ...**

وەکو خەنساخان بە چوار ڕۆڵەی خۆی لە پێناوی خودا پێشکەش کرد، کاتی شەهیدبوونیان دەیگوت: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە بە شەهیدبوونی ئەوان لە پێناوی خۆی پایەداری کردین و ڕێزی لێ ناین ... دە تۆ چاو لەو شێرەژنانە و مێژووی بەرز و ژیاننامەی بەبڕشتی ئەوان بکە.

دڕەوشانەوە: لە شنەی شەماڵ نەرم و نیانی و لە میسك بۆنی خۆش و لە شاخ خۆڕاگری فێر بە.

ناوبڕ: یەکێ لە کەموکوڕییەکانی ئێمە ئەوەیە: هێندەی لە خەڵکی دەترسێین لە خودا ناترسێین.

**بریسکە: با سستی ڕووتان تێنە کا و غەمیش مەخۆن، هەر ئێوەن کە سەردە کەون.**

## گەردانەی دەیەم: تا ببیتە ڕازاوەترین مرۆڤ لە بوونەوەر

هەر ڕووداوێ کە دێتە پێش با بەدڵیشت نەبێ
دەرووێکی خـــێری هـــەر بەدواوەوەیە

**تۆ بەو جوانییەت لە خۆر قەشەنگتری، بەو ئاکارە جوانەت لە میسك پاكتری و، بە خاكەڕاییت لە مانگ بەرزتری، بە سۆز و دڵنەرمیت لە بارانێ نەرمتری، دەی کەوابوو بە باوەڕی خۆت پارێزی لە جوانییەکەت بکە، بەهۆی قەناعەت ڕەزای دڵت بهێڵەوە، بە باڵاپۆشی چاوت لە داوێنپاکی خۆت بێ، ئارایشتی تۆ زێڕ و زیو و ئەڵماس نییە، بەڵکو دوو ڕکات نوێژی بەیانییە، تیینوویەتی ڕۆژووە بۆ خودا، خێر و چاکەیەکی پەنهانە کە بێجگە لە خودا کەس پێی نازانێ، فرمێسکێکی گەرم و گوڕە کە تاوانەکانت دەسڕێتەوە، سوجدەیەکی درێژ لەسەر بەڕماڵی بەندایەتی، شەرمکردنە لە خودا لە کاتی شەڕ و هەڵای شەیتان، بەرگی تەقوا بپۆشە، چونکە تۆ جوانترین ژنی لە هەموو دونیا، هەرچەند ئەگەر جلکەکانت دڕاوپڕا بن، عەبای ڕەوشت جوانیی لەبەرکە ئەو کات دەبیتە نازدارترین ئافرەت لە هەموو جیهان، با پێخواسیش بیت. ئامانە! نەکەی چاو لە ئافرەتانی داوێن پیس و بێباوەڕ و جادووگەر و ڕووت**

وقووت و بەرەڵا بکەی، ئەم ئافرەتانە پیتاکی ئاگری جەهەندەمێن: [لَا يَصْلَاهَا إِلَّا الْأَشْقَى] (الليل :١٥) واتە: کەس ناچێتە ناو دۆزەخەوە مەگەر خراپترین کەس.

درەوشانەوە: لە هەر شوێنێ لەم ژیانە ئەگەر کەوتیتە تاریکی لەسەرتە بۆ خۆت و لەبەر خۆت چرایەك داگیرسێنی.

ناوبڕ: ئەوەی شتێ بفرۆشێ کە پێویستی پێ نییە ئەو شتە دەکڕێ کە پێویستیەتی.

**موتەنەبی گوتویەتی:**

**لەبەر ئەوە حەزم لە زێڕ نییە کە سوودی لێ ببینم**
**بەڵکو بۆ ئەوەمە شانازی پێ پەیدا بکەم.**

**ئەوە حاڵی باوەڕدارە ئارایشتی ڕۆحی دەخاتە پێش ئارایشتی جەستە، کاروبارە مەزنەکان ڕەپێش خۆشیەکانی ژیان دەخات. دوو ڕکات نوێژی لە مزگەوتێ بەسوودتر و باشترە لەهەموو زێڕ و ئاڵتونێك.**

**بریسکە: ئەگەر بەیانیت کردەوە چاوەڕێی ئێوارە مەکە.**

## ئاڵتونی یەکەم: ئەی پایەدار

لەوانەیە شتێ هەبێ تۆ خۆتی لێ بپارێزی کەچی
ئەو شـــــتە ویستی تـــــۆ بەدوای خۆیدا بهێنێ.

**ئـــەی خوشـــکی ڕاستگۆ، ئەی بڕواداری خوداویست، وەك دارخـــوارما بە دوور لە شـــەڕ و خراپە، بەرزتر لە ئازاردانی ئەوانەی بەردت تێدەگرن، تۆ بەریان بۆ بەردەوە، زستان و هاوین هەردەم سەوزە، سوودی زۆر و زەوەندە. خوشكم لە شتۆکەی بێکەڵك بەرزتر بە، خۆت لە هەموو ئەو شتانە بپارێزە کەوا شەرم شکۆت لەکەدار دەکەن. وا بکە وتەت زکر بێ و ڕوانینت پەند بێ، بێدەنگییت بیرکردنەوە بێ، لەو کاتەدا تۆ بەختەوەری و ئاسوودەییت دەستدەکەوێ، هەمووان خۆشییان دەوێی و پێداگوتن و دوعای باش لە خەڵکی بەرز دەبێتەوە، خوداش پەڵەهەوری ناڕەحەتی و کلۆڵی، تارمایی ترس و لێڵاییت لەسەر دەڕەوێنێ، بە لایلایەی پاڕانەوەی بڕواداران بنو، بە ئاوازی پێهەڵدانی وان لە خەو ڕابە، ئەوکاتی دەزانی بەختەوەری بەس بە وشکە پارە و کەلوپەل نییە، بەڵکو بە گوێڕایەڵی خودایە، کامەرانی لە جلك و بەرگی نوێ نییە و لە حزمەتگوزاری بەندەکان نییە بەڵکو لە خوداپەرستییە.**

**درەوشانەوە: خودی خۆت بێ هیوا مەبە، بەهێوری هەوڵ دە، لەوانەیە ئەنجامی وا بێتە پێشت هیممەتت دابمرکێنێ، بەڵام تۆ لێ مەگەڕێ دەستت لێ بستێنێ.**

**ناوبڕ: لەگەڵ نەفسی خۆت تێبکۆشە چونکە نەفس هەموو خراپەیەك بە مرۆڤ دەکا.**

**بریسکە: هاوارم بکەنێ بەدەنگتانەوە دێم.**

## ئاڵتوونی دووەم: بەپیل نیعمەتەکان بڕۆ و ئەرکی خۆیان بدێ

چەندان نــاز و نیعمەت هــەن بە کەمی
سوپاسگوزاری تۆ، خودا کەمی نەکردنەوە

**بە سوپاسگوزاری و گوێـــڕایەڵی وەڵامـــگۆی نیعمەتەکانی خودای بە و بە هێندیان بزانە.**

**تام وچێژ لە ئاو وەربگرە چ بە خواردنەوە بێ یان دەستنوێژ یان خۆشۆردن. خۆت بە گەرمی و ڕووناهی خۆر داپۆشە، ئاوێزانی تریفەی مانگ بە و خۆتی پێ بڕازێنەوە. بڕۆ میوە چنینێ، تێر تێر ئاوی ڕووباران بنۆشە. بڕوانە دەریا و بێئاوانی(بیابان، سارا) چۆڵ و وشکارۆ تەی کە، سوپاسی خودای مەزن و لێبووردە بکە، لەو بەخشش و خەڵاتەی بە تۆی داوە سوودمەند بە، تکایە تکایە ناز و نیعمەتی خودا مەشارەوە، [يَعْرِفُونَ نِعْمَتَ اللَّهِ ثُمَّ يُنْكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ] (النحل :٨٣) واتە: ئەوانە بەهرەکانی خودا دەناسن (و دەزانن) پاشان ئینکاری دەکەن و زۆربەی ئەوانە هەر بێ باوەڕن. ئامانە خۆ لە نکوڵیکردنێ بپارێزە، پێش ئەوەی دڕك و داڵ ببینی لە گوڵ بڕوانە، لە جوانییەکەی ڕامێنە. پێش ئەوەی گلەیی و بۆڵەبۆڵ لە گەرمای هەتاو بکەی چێژ لە ڕووناکیەکەی وەربگرە. پێش**

ئەوەی پرتەپرت لە تاریکیی شەو بکەی ئەو ئارامی و هێمنییەی شەوت لەبیر بێ، ئاخر بۆچی ئەو ڕووانینە ڕەشبینە تاریکانەت بۆ شتەکان هەیە، بۆچی بەخششەکانی خودا لە ڕێچکەی خۆی لادەدەی؟ [أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ بَدَّلُوا نِعْمَتَ اللَّهِ كُفْرًا وَأَحَلُّوا قَوْمَهُمْ دَارَ الْبَوَارِ] (ابراهيم :٢٨)

واتە: ئایا سەیری ئەوانەت نەکردووە لە جیاتی (سوپاسی) بەهرەو چاکەی خودا بێ باوەڕ و سپڵە بوون و گەلەکەیان بەرەو هەڵدێر برد. ئەو خەڵاتانە وەربگرە و بە سینەیەکی فراوان ڕازی بە و سوپاسی خوداشی لەسەر بکە.

درەوشانەوە: پشتکردنە هەڵە و ڕووکردنە چاکە سەرچڵیەکی دوور و درێژە بەڵام لە جوانیش بەدەر نییە.

ناوبڕ: دەستی دایك و باوکت ماچ کە، دەگەیتە ڕەزامەندی.

**بریسکە: لە ڕەحمەتی خودای نائومێد مەبن**

## ئاڵتوونی سێیەم: بەس تۆبە و ئیستیغفارت هەبێ ئیدی ڕۆزییت لەسەر خودایە

هاوسێیەکەم، ئاوات و خۆزگـــــە ڕاست نیین
زۆربەی هۆکاری سەرکەوتن لەگەڵ نائومێدییە

**ئافرەتێ گوتی: کە هاوسەرەکەم مرد من لە تەمەنی سی ساڵاندا بووم وپێنج منداڵی کچ و کوڕم هەبوو، دونیام لەبەر چاوی ڕەش داگەڕا، هێندە گریام لێڵایی هاتە سەر چاوم، چارەڕەش و نائومێد بووم، غەم دەورەی لێدام، بەرگی خەفەتم پۆشی، منداڵەکانم هەموویان سەرکە و بنکە بوون و چ داهاتێکی واشیان نەبوو، بەو بڕە پارە کەمەی باوکم جێیهێشت بوو خەرجیم دەکرد، وەختایەك لە ژوورەکەی خۆم بووم، تەلەفیزیۆنم هەڵکرد و خستمە سەر کەناڵێکی قورئان، لەو دەمیدا مامۆستایەك دەیفەرموو: خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (من اكثر من الاستغفار جعل الله له من كل هم فرجا، و من كل ضيق مخرجا) واتە: ئەو کەسەی زۆر تۆبە و ئیستیغفاران بکا خودا لە خەفەتان دەیڕەخسێنێ و لە هەموو ناخۆشییەك ڕزگاری دەکا. بۆیە دەستم پێکرد زۆر زۆرم (استغفرالله) دەگوت، منداڵەکانیشم ڕاسپاد وا بکەن، خودا شاهێدە شەش مانگی تێپەڕ نەکرد، پلانی دروستکردنی باڵەخانەیەك**

لەسەر کۆنە موڵکێکی ئێمە دەرچوو، چەند ملیۆنیان بۆ بژاردین، کوڕەکەشم بووە یەکەمی سەر قوتابیانی ناوچەکەی خۆمان و، هەموو قورئانیشی ئەزبەرکرد، ئیدی کەوتە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی خەڵکی و ماڵ پڕ بوو لە خێر و فەڕ، ژیانمان خۆش بوو، خودا هەموو منداڵەکانمی کردە کەسانی چاکەکار و هەرچی غەم خەفەتە نەما، بوویمە بەختەوەرترین ئافرەتی ئەو دونیایەی.

درەوشانەوە: ئەگەر خۆت ڕادەستی بێ هیوایی بکەی ئەوا پێتدەڵێم تۆ هیچ نازانی و هەرگیزیش پەی بە بەختەوەری نابەی.

ناوبڕ: هەمیشە ئەم ئایەتەت لەبیر بێت (لە ماڵی خۆتان جێگیر بن)

**بریسکە: بەڕاستی جگە لەوانەی بێباوەڕن کەس لەڕەحم و میهرەبانی خودا نائومێد نابێ.**

## ئاڵتوونی چوارەم: بە دوعایان تەنگ و چەڵەمەت لێ دوور دەکەویتەوە

با گەورەش بێ بەڵام خودا هەندێ نیعمەت
وەکو بەڵا دەنێرێ، هەندێ کەس بە نیعمەت بەتاقی دەکاتەوە

**هاوڕێیەکم هەیە هەتا بڵێی پیاوێکی چاك و خوداناسە. خێزانەکەی گیرۆدەی نەخۆشی شێرپەنجە بوو، سێ منداڵیشی هەبوو، ئەو دونیایەی لێ وێکهاتەوە و زەوی لێ تەنگ و تاریك بوو، مامۆستایەکی ئاینی ڕێنووێنی کردبوو، پێی گوت بوو: با بۆ شەونوێژ هەڵبستێ و لەبەرە بەیان دوعایان بکا و (استغفرالله) بڵێتەوە، تۆش قورئان لەسەر ئاوی زەم زەم بخوێنە و بیدە خێزانەکەت، کابرا لەسەر ئەو حاڵەی بەردەوام بوو، خوداش بەو دوعایانە دەرگەی خۆی لێ کردەوە، کابرا خێزانی خۆی بە ئاوی زەم زەم شۆرد کە دوعای لەسەر خوێندرا بوو، ژنە لە نوێژی بەیانی تا تاوکەوتنێ، لەگەڵ مێردەکەی خەریکی خوداپەرستی بوو، هەر لە نوێژی مەغریبێ هەتا عیشایێ بەردەوام خەریکی (استغفرالله) و تکا و ڕجایان بوو. ئیدی خودای تەعالا شیفای نارد و ژنەش لەو**

دەردەی چابووەوە و پێستی ناسکتر و پرچی جوانتری هاتەوە، لەوەو دوا وازی لە (استغفرالله) و شەونوێژ نەهێنا، ئەی پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی چارەساز و شیفابەخشە جگە لەخۆی کەس خودا نییە، هێ لە خۆی پەروەردگارێك نییە.[1]

ئەی خوشکەکەم ئەگەر نەخۆشی پەنا وەبەر خودا ببە و، زۆر دوعا و استغفرالله بکە و بگەڕێوەوە، کارت لەسەر ئاسان دەبێ، دوعایەکانیشت وەردەگیرێ، هەرچی ناخۆشی و بەڵایە نامێنن: [أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ] (النمل :٦٢)

واتە: ئایا زاتێ کە دێت بە هاواری ناچارو داماوەوە کاتێ هاواری لێ دەکات و ناخۆشی و بەڵاکان لادەبات و دەتان کاتە جێنشینی گەلانی تری سەر زەوی ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەل خودادا (نەخێر نییە) بەڵام زۆر کەم بیردەکەنەوە.

درەوشانەوە: لە ئێستا و ڕابردووت بڕوانە، ژیان لە چەند ئەزموونێکی بەدوای یەك پێکهاتووە، پێویستە مرۆڤ بەسەرکەوتوویی لێی بێتە دەرێ.

ناوبڕ: ئەم شەشەت بەسە: ئاین و چاکەکاری، قەناعەت و تەکوزی، داوێنپاکی و ئەمەك.

---

(١) هێ: ئامرازی هەڵاوێردنە (حصر و استسناء)، ئەم ئامرازە لە دەشتی هەولێر بەکاردێت. بۆ هەڵاوێردنی شتێك لە کۆمەڵێ شت، مانای (غیر، الا) دەدات. کەم لە نووسەران بەکار دێنن. نمونە: لا اله الا الله، واتە: هێ لە خودای ڕاستی چ خودای دیکە نییە. جاء الطلاب الا زیدا، واتە: هێ لە زەیدی هەموو قوتابییەکان هاتن.

**بریسکە: خودا بۆ باوەڕداران دلۆڤانە**

## ئاڵتوونی پێنجەم: وریای بێئومێدی و داڕووخـــــان بە

لەنــــاو کارەســــاتان ئەگەر تووشی بێئومێدی بووی لەبیرت بێت ئەوە پێت دەڵێ: خۆشی و نیعمەت چۆنە!

**کوڕە گەنجێکی تاقانە لە زیندانێ کرا، ئیدی خەو لە چاوی دایکی زڕرا و غەم و خەفەت شەش دانگی لێ گرت. ئەوەندە گریا، تاوەکو گریانی بێزار کرد، تا خودا ئەم زیکرەی خستە دڵی (لا حول ولا قوة الا بالله) لەمەبەدوا زۆر ئەو پەیڤە مەزنەی دەگوتەوە کە گەنجینەیەکە لە گەنجینەکانی بەهەشتێ. چەند ڕۆژێکی نەبرد - دوای ئەوەی نائومێد بوو لە ڕزگار بوونی کوڕەکەی - یەکێ لە دەرگای دا و خۆشی و شادی و فەرەحنایی باڵی بەسەر ئەم دایکەدا کێشا، بەڵێ ئەمە پاداشتی ئەو کەسەیە کە دڵی بە خودا پێوەستە و هەموو کاروبارێکی خۆی دەداتە دەست خودا. تۆش زیکری (لا حول ولا قوة الا بالله العلي العظيم) بڵێ، چونکە هەتا حەز بکەی گەورەیە و ڕازی بەختەوەری و سەرفرازییە، هەر بیڵێوە، نسکۆی غەمان تێهەڵدە و پەژارە و دڵتەنگی و عاجزی ڕاونێ، دڵخۆشی خۆت بدەوە و چاوەڕێی دەرووی خێر بە، ئاگات لەخۆ بێ پەتی تکا و ڕجا نەپچڕێنی و ورە**

بەرمەردە. خۆت تووشی ڕووخان و شکست مەکە چونکە هەرچی تەنگ و چەڵەمە هەیە خۆشییەکی لەدوایە. لە کۆنەوەش هەر وا بووە، خودا لە ئیشی خۆی بووەتەوە. خودا لەگەڵ ئەو کەسەیە گومانی باشەی پێ هەیە و، پشتی پێ دەبەستێ و، داوای لێدەکا و، چاوەڕوانی دەرووی خێرە لێی.

درەوشانەوە: هێندە غەم و خەفەت و کێشەی خۆت مەکە سەرباسی قسان چونکە تۆ بەو کارەت بەربەستێك لەنێوان خۆت و شادمانی دادەنێی.

ناوبڕ: لەسەر تۆبە و ئیستیغفار بەردەوام بە، بەڵکو دەرگەیەکت لێ بکرێتەوە!

**بریسکە: ڕاستییەکەی پەروەردگاری تۆ خاوەنی لێبوردنێکی فراوانە.**

## ئاڵتونی شەشەم: ماڵی خۆت شانشینی سەربەرزی و خۆشەویستییە

بڵێ: ئەو خودایە میهرەبانە و باوەڕمان پێ هێناوە،
شوێنکەوتـــووی خۆشـــــەویستی مەدینەیمە ﷺ.

**ئەی خوشکە بەڕێز و سەلارەکەم: لە ماڵێ خۆت دانیشە و تەنیا بۆ کاری پێویست بڕۆ دەرێ، ئەو ماڵەی خۆت ڕازی بەختەوەریتە [وقرن فی بیوتکن] واتە: لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە. تۆ لە ماڵێ تامی کامەرانی دەکەی، هەر لە ماڵێ دەتوانی پارێزگاری لە نامووس و شەڕەف و شەرم و شکۆی خۆت بکەی. ئافرەتانی پەراوێزخراو زۆر دەچنە دەرێ، لەخۆوە دەچنە بازاڕ و دەگەڕێن و دەسووڕێن، جا چ بۆ گەڕان بەدوای مۆدێل یان بۆ جلك و بەرگ یان چوونە شوێنکاری بازرگانی یاخود لە هەموو شتێکی نوێ و تازە و سەیر دەپێچنەوە، هیچ غەمێکی ئاین و پەیامی بانگەوازی و زانیین و ڕۆشەنبیری و زانست و فێربوونیان نییە، ئەم ئافرەتانە زێدەڕۆن و هەر لە پارە سەرفکردنێنە، هەموو غەم و خەیاڵیان لە خوردن و پۆشاکە. ئامان سەد ئامان هێندە ماڵ بەجێمێڵە، چونکە ماڵ شوێنی شادی و جێگەی ئاسوودەیی و دڵنیاییە، ئەشکەوتی دۆستایەتی و قیبلەی**

**سەلامەتییە لە خەڵکی، ماڵێ خۆت بکە زانکۆی خۆشەویستی و دەروازەی بەخشین و چاکە.**

**درەوشانەوە: تەنیا لای ئەوانە باسی کێشە و ئاریشەی خۆت بکە کە دەتوانن بە ئەندێشە و وتەکانیان شادمانت بکەن.**

**ناوبڕ: بەرگە کۆنەکانی تۆ لای هەژاران نوێیە.**

**بریسکە: کاروباری بڕودار چەند سەیرە هەمووی هەر خێرە.**

## ئاڵتوونی حەوتەم: ئاگادار بە تۆ کاتی زۆر گوتنت نییە

مانگی تابان بزەی دێ و ئەستێرەکان چەپڵەی لێدەدەن
کەوابێ بۆ غەم خـــەریکە ئێمە بکوژێ و بمانخنکێنێ؟!

**واز لە دەم دەمانێ و کێشمەکێشم و چلەحانێی بێ بەر و مایە بێنە، ئەم شتە دڵت توند دەکا و حەوسەڵەت ناهێڵێ. لەسەر ئەو بابەتانەی ڕوانگەی کەسیی تێدایە هەوڵ مەدە هەموو خەڵکی ڕازی بکەی، بەڵکو بێ ڕوشاندن و پاتەکردنەوە ڕای خۆت بڵێ، بێ ئەوەی گرژی دروست بکەی، خۆت لە باوەگۆدانەوە و ڕەخنەکاری دوور بگرە چونکە ئەم شتانە سەر و دڵت دەگرن و وێنەیەکی ناشیرینی تۆ پیشاندەدەن. پەیڤی خۆت بە نەرم و نیانی و لەسەرخۆیی بڵێ، ئەوکاتی دەتوانی ببیتە پاشای دڵەکان و ئاوەدانی ڕۆحەکان. ئەو شتانەی ببێتە هۆی غەم و خەفەت و تانە و تەشەر و کەمکردنەوەی خەڵکی، پاداشت و چاکەت ڕەش دەکەنەوە و تاوانت لەسەر کۆدەکەنەوە، دڵنیایی لەلات بار دەکا، بە چاککردنی نەنگی و کەموکوڕیەکانی خۆت سەرقاڵ بە و واز لە عەیبی خەڵکی بێنە، چونکە خودای مەزن ئێمەی بە تەواوی و بێتاوانی دروست نەکردووە، بەڵکو هەموومان**

**تاوان و کەم وکوڕیيان هەيە، ئەی خۆشی بۆ ئەو کەسەی واز لە عەیبی خەڵکی دێنێ و سەرقاڵی عەیبەکانی خۆیەتی.**

**درەوشانەوە: لەسەر ئەو دایکەی منداڵەکەی لە شوێنێکی بەرز بەردەبێتەوەپێویستە کات بە گریان و قیژەقیژ تێنەپەڕێنێ، بەڵکو لەسەریەتی برینی منداڵەکەی چارەسەر بکا.**

**ناوبڕ: تەنانەت گوتنی ئۆف بۆ دایك و باوك حەڕامە چ جای زیاتر؟!**

**بریسکە: بزانە ئەوەی توشت دەبێ هەمووی بە هۆی هەڵەی تۆوە نییە.**

## ئاڵتوونی هەشتەم: دەروون ڕووناك بە دونیا سڵاوت لێ دەکا

وا دەزانـــــی بێهیوایی هـــەر وا بـــــەردەوام دەبێ ئەگەر شتێ بەردەوام بێ کوا خەڵکی بە سەیری دەزانن.

**بە گۆشەنیگایەکی گەشبینانە لە ژیان بڕوانە، ژیان دیاری خودایە بۆ بەنیادەم، دەی کەوابێ دیاری خودا قەبوڵ بکە، بە شادی و خۆشییەوە وەریبگرە. بەیانیان بەڕووناکی و بزەی ژیان ڕۆژ بکەوە، شەویش بە ویقار و هێمنییەوە بەسەر ببە، بە ڕوناکی و تیرۆژەوە ڕوو لە ڕۆژ بکە، تێر تێر ئاوی زوڵاڵ و فێنك بخۆوە و سوپاسگوزار بە، پڕ بە سینەت هەوای پاك و بێگەرد هەڵمژە، بۆنی گوڵان بکە، بە چاوی پەند لەو دونیایەی بڕوانە، ئەو بەخششە خودایە لە زەوی بڕنە، هەر لە دەسکە گوڵ و خونچە و سروەی شەماڵ و و بۆن و بەرامەی مێرگ و باغچە و تاوی خۆر و پڕشنگی مانگ، ئەو خەڵات و نیعمەتانەی خودای بگۆڕە و بیکە توێشووی ڕێ بۆ بەندایەتی خودا و سوپاسگوزاری لەسەر خەڵات و متمانە و ڕێز. ئاگات لە خۆ بێ مۆتەکەی غەم و خەفەت لە دیتنی ئەو نیعمەتانە بێبەشت نەکا نەوەك ببیە کەسێکی**

منجڕ و لامل، بەڵكو بزانە خودا ڕۆزیدەر و ئافەرێنەرە، ئەو هەموو نیعمەتەی بۆ ئەوە دروست كردووە تا یارمەتی مرۆڤ بدەن بۆ ملكەچی و خوداپەرستی، ئەوەتا خۆی دەفەرمووێ: [يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ] (المؤمنون :٥١) واتە: ئەی نێرراوانی خودا لە خۆراكی پاك (حەڵاڵ) بخۆن و كردەوەی چاك بكەن (چونكە) بەڕاستی من بەوەی ئێوە دەیكەن ئاگادارم.

درەوشانەوە: زۆرترین و پاكترین ڕێز و پایە لە لای ئەوانەیە كە هیچیان نییە، بەڵام بەهای پەیڤ و خەندە دەزانن، چەندە زۆرن ئەوانەی كە دەبەخشن دەڵێی بە شەقان لە كابرای دەدەن.

ناوبڕ: توڕە مەبە ژیان لەوەی كورتترە كە تۆ پێشبینی دەكەیت.

**بریسکە: هەر کەسێ لە خوداترس بێ، خودا دەرووی لێ دەکاتەوە.**

## ئاڵتوونی نۆیەم: نەبووە و نەگونجاوە بەختەوەری بە تەواوی بۆ کەسێك هاتبێتە دی یان تەواوی خێر و خۆشی بۆ مرۆڤێك بووبێ.

بە زکر و یادی خودا غەمان فڕێ دە و لە تاریکی شەوی ئارەزووپەرستی هەڵێ و دوور کەوە.

**ئەگەر وەها تێبگەی ژیان لە سەدا سەد بە ویستی دڵی تۆ و لە سوودی تۆیە، دڵنیا بە زۆر هەڵەی، ئەو شتە بەس لە بەهەشتێ هەیە، لێ لەم دونیایەدا بە ڕێژەیەکی دیاریکراو هەیە و هەرگیز هەموو ئەو شتانەی دەمانەوێ و حەزمان لێیە تەواو نابن. دواجار هەر تووشی بەڵا و نەخۆشی و کارەسات و تاقیکردنەوە دەبین، بۆیە لە خۆشییدا سوپاسگوزار بە و لە تەنگانەدا ئارامت هەبێ، لە دونیای نمونەیی و خەیاڵدا مەژی، بەجۆرێ بتەوێ هەر لەشساغ بی و هەرگیز نەخۆش نەکەوی و هەر دەوڵەمەند بی و هەژار نەبیت، بەختەوەر بی و قەت غەمبار نەبیت، خێزانەکەت هیچ کەموکوڕییەکی نەبێ و برادەرەکەت بێ کێماسی بێ، دڵنیا بە ئەو شتە قەت بەدی نایێ. خۆت لەسەر چاوپۆشی لە کەموکوڕی و هەڵەوپەڵە و دیدگای لارو وێر ڕابێنە، تەنیا لە شتە باش و چاکەکان بڕوانە. لەسەرت پێویستە گومانت باش بێ و، بڕوبیانووی خەڵکی**

وەربگری و پشت بە خودای ببەستی، چونکە خەڵك هیی ئەوە نیین پشتیان پێ ببەستە و کاروباری خۆتیان پێ بسپێری: [إِنَّهُمْ لَنْ يُغْنُوا عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ] (الجاثية : ١٩)

بێگومان ئەوانە لەلایەن خوداوە هیچ سوودێکت پێ ناگەیەنن و بەڕاستی ستەمکاران هەندێکیان دۆست و پشتیوانی هەندێکیانن و خودا دۆست و پشتیوانی پارێزکارانە.

درەوشانەوە: لێ مەگەڕێ هیچ قانێك لەژیانت تاریك بێ، ڕوناکی هەر هەیە، ئەوەندەی دەوێ تۆ چاو بگێڕی تا دەیبینیتەوە.

ناوبڕ: بە ئیرەیی خۆ مەفەوتێنە.. هەر سکت بە خۆ بسووتێ!

**بریسکه: ئه‌وه‌ی له‌خودای بترسێ کاروباری بۆ ئاسان ده‌بێت.**

## ئاڵتوونی ده‌یه‌م: برِۆ نێو باغی زانیاری

ئه‌ی ئه‌و که‌سه‌ی له‌ خۆت ڕازی و پشتت به‌ زه‌مانه‌ به‌ستووه‌
ئایا تۆ به‌ ساغ و ته‌واوی ده‌مێنیته‌وه‌؟!

**یه‌کێ له‌ هۆیه‌کانی به‌خته‌وه‌ری تۆ تێگه‌یشتنته‌ له‌ ئاینه‌که‌ت، فێربوونی ئاین سینه‌ت گوشاد ده‌کا و، خوداش له‌ خۆت ڕازی ده‌که‌ی، هه‌روه‌کو خۆشه‌ویستﷺ ده‌فه‌رمووێ (من یرد الله به خیرا یفقه فی الدین) واته: ئه‌وه‌ی خودا ویستی خێری بۆ هه‌بێ له‌ ئاین شاره‌زای ده‌کا. ئه‌و کتێبه‌ زانستییه‌ به‌سوود و باشانه‌ بخوێنه‌وه‌ که‌ زانیاریت زیاد ده‌که‌ن و له‌ ئاین حاڵیت ده‌که‌ن وه‌کو کتێبی: ریاض الصالحین و فقه السنه و فقه الدلیل و ته‌فسیره‌ ئاسانه‌کان و په‌یامه‌ به‌سووده‌کان. بزانه‌ باشترین کاری تۆ ئه‌وه‌یه‌ زانیارییت له‌باره‌ی ئه‌وه‌ هه‌بێ خودا له‌ قورئاندا چی له‌ تۆ ده‌وێ و، نیازی پێغه‌مبه‌ر ﷺ له‌ فه‌رمووده‌ چییه‌، بۆیه‌ زۆر له‌ قورئان ڕابمێنه‌و له‌گه‌ڵ ده‌سته‌ خوشکه‌کانت بیخوێنه‌وه‌ و، هه‌ندێکیش له‌به‌ر که‌ و، گوێی لێ بگره‌ و کاری پێ بکه‌، چونکه‌ بێئاگایی له‌ شه‌ریعه‌ت تاریکاییه‌ بۆ دڵ و ده‌روون، که‌وابێ با کتێبخانه‌یه‌کت هه‌بێ ـ هه‌رچه‌ند بچوکیش بێ ـ و کتێبه‌ باش و**

بەسوودەکان و شریتی بەکەڵکی تێدا بێ، ئاگات لە بەهەدەردانی کات بێ و لە گوێگرتن لە گۆرانی و سەیرکردنی زنجیرە فیلمەکان بەسەری مەبە، لەبەرئەوەی هەر چرکەیەك لە تەمەنت لەسەرت حیسابە بۆیە کاتی خۆت لە ڕەزامەندی خودای بەسەر ببە.

درەوشانەوە: سەختترین شت بە زەردەخەنەی مرۆڤێکی بەهێز و پتەو ئاسان دەبێ.

ناوبڕ: بەهێزترینی بەهێزان و دەوڵەمەندترینی دەوڵەمەندانت لەگەڵە... الله.

**ئافرەت لە فکری خۆی وادادەنێ کە بچێتە زێڕینگر هەتا مرواری گرانبەها بکڕێ، لێ زۆرینەیان لەلایان زەحمەتە مرواری بەنرخی لێزانی و ئامۆژگاری باش بکڕن، چونکە بەهای ئەو مرواریانە نەفسێکە خۆپارێز بێ، دڵێکی خۆشەویستە، هەوڵی ڕاستگۆیانە، نیازێکی باش و کاری دروست و ڕاستبێژییە.**

**بریسکە: تۆ چوزانی بەڵکو خودا کارێکی تر پێش بێنێ.**

## مرواریی یەکەم: شۆڕابەی فرمێسکان و دڵی بریندارت لەبیر بێ

ئەرێ نەتبینیووە کاتێ تاریك و نوتەکی شەو لێوڕێژ دەبـــــێ، ڕوونـــــاکی بەیانی دێ.

**ئەدیبێك جوانی فەرموە:**

**ئەگەر وا حاڵی بووی کە گفت و پەیمانت لە زەمانە وەرگرتووە کە شتەکان بە ویستی تۆ بن و ئەوەی تۆ حەزت لێیە و پێت خۆشە بێتە دی، چاك بزانە تۆ جڵەوی خۆت داوەتە دەستی غەم و خەفەت، لەو کاتەی حەز و خولیایەکت نایێتە دی یان ویستێکت جێ بەجێ نابێ، ئەگەر تۆ شێوەی ڕەوتی گێتی و زەمانە بزانی کە نەریتی دان و سانە و بەخشین و نەدانە، ئیدی ژیان وایە کە شتێکت بداتێ لەبیری ناچێ لێشت دەسێنێتەوە، ئەوە نەریتی کاتە و بۆ هەموو بەنیادەمێك وا بووە، جا چ ئەو بنیادەمە لە کۆشکێك بێ یان لە کۆڵیتێك بێ، جا چ ئەو کەسە بەسەر قولەی قافدا بڕوا یان لەنێو تەپ و تۆز پیادەڕۆ بێ، جا لەبەر ئەوە هەندە غەمێ مەخۆ و فرمێسکەکانت بسڕە، تۆ یەکەم کەس نییت گرفتاری تیری زەمانە دەبیت، گرفتەکانی تۆ شتێکی تازە نییە لەنێو تۆماری بەڵا و گرفتارییەکان.**

درەوشانەوە: واز لە چاوخشاندنەوە بە گوناهەکانت بێنە، لەو کردەوە باشانە بڕوانە کە لەبری ئەو تاوانانە دەیکەی.

ناوبڕ: ئافرەتی لەخوداترس زیاتر بە کردەوەکانی بانگەواز دەکا نەك بە قسە.

بریسکە: بەڵا وات لێ دەکا دوعای بکەی

## مرواریی دووەم: ئەوانە بەختەوەر نیین

ئەگەر قەیران تاوی سەند، خۆشیی نزیکە
و هـەواڵی ڕوناکی سپێدە دەداتە شەوێ

**لە ژیانی خۆتدا چاو لەو کەسانە مەکە خەریکی ڕابوواردن و فشە و زیادەڕەوی و خۆبادانن، ئەو حاڵەی ئەوان تێیدان هیی ئەوەیە دڵمان بۆیان بسوتێ نەك خۆزگەیان پێ بخوازین، ئەو خەڵکانەی وا هەموو فکر و خەیاڵیان لەسەر پارەخەرجکردن و خۆشی و چێژە و هەموو هەوڵ و تەقەلایان بۆ سك و داوێنە ئەوجا چ بە حەلاڵی بێ یان بە حەرامی، هەرگیز ئەوانە بەختەوەر نیین، ئەم جۆرە کەسانە جگەرسۆز و وەڕەزن چونکە هەموو ئەوانەی لە بەرنامەی خودا لادەدەن، هەموو ئەوانەی بێ فەرمانی خودای دەکەن، هەرگیز چاویان بە خۆشی و، فەرەحنایی ناکەوێ. وا گومان مەبە ئەوانەی خەریکی ڕابواردن وزێدەڕەویین دڵیان زۆر لەو جۆرە کەسانە خۆشترە کەوا لەسەرتووکی نەرم و دیباج و ئاوریشم لەنێو کۆشکی جوان ڕازاوە دەخەون، چونکە ئافرەتی نەداری بڕوادار و خوداناس لەم جۆرە کەسە بەدکار و لادەرانە کامەرانترن.**

**درەوشانەوە: بەختەوەریی لەنێو خودی خۆت دایە، بۆیە لەسەرت پێویستە ئاڕاستەی هەوڵ و تەقەلات لە خۆتەوە بێت.**

**ناوبڕ: بە پیرەژنێکیان گوت: چ پارە و ماڵت هەیە؟ گوتی: ئا، متمانەم بە خودا هەیە.**

**بریسکە: دڵنیا بە و بزانە بێجگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی تری ڕاستیی نییە.**

## مرواریی سێیەم: ڕێبازی خودا باشترین ڕێیە

لەوانـــەیە دڵ لـــە شتێ بێزار بـــێ، بەڵام
وەکو کردنەوەی پەتی قاچی وشتر ئاسان بێ

**بەختەوەری چییە؟ ئایا بەختەوەری لە پارە و سامانە؟ یان لە پلەو پایەیە، وەڵامگەلی فرە هەن... لێ با ئێمە بڕوانینە بەختەوەری ئەم ئافرەتە:**

**پیاوێك كێشەی لەگەڵ هاوسەرەكەی خۆی هەبوو.. بە ژنەی گوت: مەرج بێ ژیانت لێ تاڵ كەم، ژنەش زۆر بە هێواشی پێی گوت: ناتوانی، كابراش گوتی: چۆن؟ ژنە گوتی: ئەگەر بەختەوەری لە پارە و سامان دایە ئەوا تۆ منت بێبەش كردووە، ئەگەر لە خۆڕازاندنەوە دایە لە منت قەدەغە كردووە، كەوابێ نە تۆ و نە كەسی دیكە هیچتان لەدەست نایێ، ئەوەتا من بەختەوەریم لە بڕوایەكەم دایە و بڕواش دەنێو دڵمە، تەنیا خوداش پاشای دڵمە.**

**ئا ئەمە بەختەوەری بەڕاستییە.. ،بەختەوەری بڕوا، كەس هەست بەو كامەرانییەی ناكا تەنیا ئەو كەسە نەبێ دڵ و دەروونی لێوانلێوە لە خۆشەویستی و ئەوینی خودا، ئەوەی خاوەنی**

بەختەوەری ڕاستییە هەر خودایە و بەس..کەوابێ بە گوێڕایەڵی خودا داخوازی بەختەوەری بکە.

تاکە ڕێ بۆ بەدەست هێنانی بەختەوەری لەوەیە خۆت لە دینە ڕاست و دروستەکەی خودای شارەزا بکەی کە پێغەمبەریﷺ بۆ ناردووە، ئەوەی ئەو ڕێیەی پێ زانی باکی نییە، لەبن ساباتێك یان لەسەر شۆستەیەك بنووێ، کەرتە نانێکی بەسە، ئەو کەسە دەبێتە بەختەوەرترین کەسی ئەم دونیای، بەڵام ئەوەی گومڕێ بێ هەموو تەمەنی کەمە و خێر لە ماڵی خۆشی نابینێ، ماڵداریکەری ڕەنج بەخەسارە و پەشیمانی لەدوایە.

درەوشانەوە: ڕاستە ئێمەپێویستمان بە پارە و سامانە بۆ ئەوەی بژیین بەڵکو ئەوە بەو مانایە نایەت ئێمە لەپێناوی ماڵ و پارە بژیین.

ناوبڕ: دڵێك بە تەقوای ڕازابێتەوە زۆر لە ڕوخساری جوان باشترە.

**بریسکە: خودایە داوای لێخۆشبوون و تەندروستیت لێ دەکەین**

## مرواریی چوارەم: ئەگەر ڕێگاکانت لێ تەنگ بوو هۆشێکت بە خوداوە بێ

ئەگەر کاروبارت لێ تەنگ وناجۆر بوو
بـــــــیرێك لە الـم نشــــــرح بکە

**ئیبنو جەوزی دەڵێ:**

**((شتێکم لێ بە زەحمەت کەوت بوو، غەم و خەفەتێکی زۆری بۆ پەیدا کردبووم، دەگژ فکری قووڵ قووڵ ڕادەچووم هەتا بتوانم ڕێچارێك بدۆزمەوە بەڵکو لەو شتە ڕزگارم بێ، هیچ ڕێیەکم پێ شك نەهات، هەتا ئەو ئایەتەم کەوتە بەر دڵ [وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا] (الطلاق :٢) واتە: هەر کەسێ خوداناس بێ، خودا دەروی لێ دەکاتەوە). ئیدی زانییم لەخوداترسان و خۆپارێزی هۆیە بۆ دەربازبوون لە هەموو غەمێك، هەرچی زووە ڕووم لە تەقوا کرد و دەرووی خێرم لێ کرایەوە)).**

**منیش گوتم: لای هۆشمەندان، لەخوداترسان هۆی هەموو خێر و بێرێکە هەرگیز بێتاوان تووشی سزا نابی و، سزاش بێ تۆبە نارِوا، بۆیە غەم و مەینەت و دەردەسەریش بەشێکن لە سزای ئەو کردەوانەی کە ئەنجامت داون، هەر لە کەموکوڕی لە نوێژ یان پاشملەی موسڵمانێك یان کەموکوڕی لە باڵاپۆشی یان ئەنجامدانی**

حەرامێك. جا هەر کەسێ لە بەرنامەی خودا لابدا دەبێ نرخەکەی بژێرێ، نرخی لیستی فەرامۆشکردنێ بدا، ئەوەی بەختەوەری وەدی دێنێ خودای بەخشندە و میهرەبانە، جا چۆن بەختەوەری لە یەکێکی دی داوا دەکەی؟ ئەگەر بەختەوەری بەدەستی خەڵکی بایە کەس لەسەر ئەو زەوییەی بێ غەم و ماتەمبار و دڵئازار نەدەبوو.

درەوشانەوە: لەو بیرکردنەوە دوور کەوە و لەبیری کە، کە هەموو شتێکت نایێتە دی. جەخت لە سەرکەوتن بکەوە، ئەوکات ناکرێ دڵ لە دڵ بدەی.

ناوبڕ: تا سەرکەوتن و ڕزگاری بەدەست بێنی بەیانییت بە زکری بەیانیان بکەوە.

**بریسکە: من لەگەڵ گومانی بەندەی خۆم دام**

## مرواریی پێنجەم: هەموو ڕۆژێکت بکە تەمەنێکی نوێ

ئەگەر ئازایەتیت نواند لە پێناو شەڕەف
بە کەمتر لە پایەی ئەستێران ڕازی مەبە

**لەوکاتەی مرۆڤ لە پشتیوانی خودایی دادەماڵدرێ و لە بەرەکەتی ئەو بێبەش دەبێ هەرچی بەهرەی زیرەکی و توانا و کەشخەیی و زانیارییە لێی دەبێتە خەشم و دەردو بەڵا. بۆیە خودا ئەو خەڵکەی بۆ پاشەڕۆژێ دەترسێنێ تا لە خودا دوورەپەرێز و ڕەمیدە نەبن و تووشی سەر لێتێکچوون نەبن.**

**وا هەڵدەکەوێ تۆ بە ڕێگەیەکدا دەڕۆیت و ئۆتۆمۆبێلێك زۆر بەتالوکە دەڕوا، وا خەریکە دەتگاتێ و دەتشێلێ و ژیانت لەبەین دەبا، تۆش تەنیا هەڵاتن و خۆدەربازکردنت لە دەست دێ، ... بەهەمان شێوە خودا دەیەوێ بەندەکانی خۆی وریا بکاتەوە ئەگەر لەو تەریك بن توشی چ تیاچوون و ماڵوێرانییەك دەبن، پێیان دەڵێ چۆن خۆمان لەوەها بوارێك ڕزگار بکەین کە هەر خۆیەتی دەگاتە فریامان: [فَفِرُّوا إِلَى اللَّهِ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ وَلَا تَجْعَلُوا مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ إِنِّي لَكُمْ مِنْهُ نَذِيرٌ مُبِينٌ] (الذاريات :٥١)**

**واتە: ئینجا بەپەلە بەرەو لای خودا بڕۆن بەڕاستی من لەلایەن خوداوە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم بۆ ئێوە. لەگەڵ خودادا**

پەرستراوی تر دامەنێن، بەڕاستی من لەلایەن خوداوە ترسێنەرێکی ئاشکراو ڕوونم بۆ ئێوە.

گەڕانەوە بۆ خودا وا لە مرۆڤ دەکات دووبارە خۆی نوێ بکاتەوە و دووبارە ژیانی خۆی ڕێکبخاتەوە، پێوەندییەکی باشتر لەگەڵ خودای دروست بکا و کردەوەی باشتر ئەنجام بدا، پەیمانێك بدا کەوا لەم دوعایەدا ڕەنگ دەداتەوە: اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ، وَأَنَا عَلَي عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ، أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ، أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ، وَأَبُوءُ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لاَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلا أَنْتَ.

واتە: (خودایە تۆ پەروەردگارمی و هیچ پەرستراوێکیش نییە، کە شایستەی پەرستن بێت جگە لە تۆ، دروستت کردووم و منیش بەندەی تۆم. خودایە، من لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەی خۆمم، کە بە تۆم داوە تا چەندە لە توانامدا بێت. خودایە، پەنات پێ دەگرم لە شەڕ و خراپەی ئەوەی کە ئەنجامم داوە. خودایە، دان بەوەدا دەنێم، کە تۆ بەخشش و نیعمەتت بەسەردا ڕشتووم، دانیش بە تاوانەکانمدا دەنێم و داوای لێ خۆش بوونت لێ دەکەم، هیچ کەسێکیش لە تاوانەکان خۆش نا بێت، جگە لە تۆ (چونکە بەڕاستی خۆشبوون لە تاوان بەس تەنیا شایستەی خودایە))

درەوشانەوە: ئەگەر لە یەکێ لە ئیش و کارەکانت سەرکەوتوو نەبووی خۆت مەدە دەست نائومێدی، ڕا ڕا مەبە و وا گومان مەبە کە ناتوانی چارەی بۆ بدۆزیتەوە.

ناوبڕ: چاوت بە فرمێسکی پەشیمانی تەڕ بێت لەوەی جوانترە کل ڕێژی بکەی.

**بریسکه: زه‌رده‌خه‌نه‌یه‌ك به‌ ڕووی برایه‌كه‌ت چاكه‌یه‌.**

## مرواریی شه‌شه‌م: ئافره‌تان ئه‌ستێره‌ی ئاسمان و هه‌ساره‌ی تاریكین

**ئافره‌تی موسڵمانی چاكه‌كار ئه‌وه‌یه‌ به‌نه‌رم و نیانی له‌گه‌ڵ هاوسه‌ری خۆی ده‌جوڵێته‌وه‌ دوای گوێڕایه‌ڵی خودا به‌ گوێی مێردی خۆی ده‌كا. پێغه‌مبه‌رﷺ له‌ چاكی ئه‌م جۆره‌ ئافره‌تانه‌ دواوه‌ و به‌ ئافره‌تی نوونه‌یی دایناون كه‌ له‌سه‌ر پیاوان پێویسته‌ چاویان لێیان بێ، جارێك له‌ پێغه‌مبه‌ریانﷺ پرسی: كام ئافره‌ت باشترینه‌؟ فه‌رمووی ئه‌و ئافره‌ته‌ی كه‌ مێرده‌كه‌ی ته‌ماشای بكا و دڵخۆش بێ، گوێڕایه‌ڵی مێرده‌كه‌ی بكا ئه‌گه‌ر شتێكی پێ گوت، سه‌رپێچی له‌ داخوازیه‌كانی نه‌كات و ماڵی پیاوه‌كه‌ی وا سه‌رف نه‌كا كه‌ پێی خۆش نه‌بێ.**

**كاتێك خودا ئه‌م ئایه‌ته‌ی [وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنْفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ] (التوبة :٣٤)**

**واته‌: ئه‌وانه‌ی ئاڵتون و زیو سه‌ریه‌ك ده‌نێن و كۆده‌كه‌نه‌وه‌ و له‌ ڕێی خودا به‌ختی ناكه‌ن ئه‌وه‌ موژده‌ی سزایه‌كی ئازارده‌ریان**

پێ بدە). کە ئەم ئایەتە دابەزی، عومەر(ڕەزای خودای لێ بێ) ڕۆیشتە دەرێ و سەوبان(ڕەزای خودای لێ بێ) کەوتە دوای و چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺ عومەر بە پێغەمبەریﷺ گوت: ئەی پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتە لەسەر یاوەرانت سەختە و پەشۆکاوین! بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمووی: شتێکت پێ بڵێم کە باشتر بێ لەو گەنجینەی مرۆڤ هەڵیدەگرێ: ئافرەتی باش. ئەگەر لێی بڕوانی دڵخۆش ببی و ئەگەر شتێکت پێگوت بیکا و ئەگەر کابرا دیار نەبوو ژنە بەئەمەك و خۆپارێز بێ.

پێغەمبەرﷺ چوونە بەهەشتی ژنانی بە ڕەزامەندی مێردەکانیان پێوەست کردووە، لە ئوم سەلەمەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((ایما امراة ماتت و زوجها عنها راض دخللت الجنة)) واتە: هەر ئافرەتێك بمرێ و هاوسەرەکەی لێی ڕازی بێ دەچێتە بەهەشت، لەم جۆرە ئافرەتانە بە دەبیتە دڵخۆشترین ئافرەت.

درەوشانەوە:جێگەیەك لە ڕێزی یەکەم هەیە بۆ تۆیە بە مەرجێك تۆش لەوە زیاتر و باشتر ئەنجام بدەی کە دەیزانی.

ناوبڕ: چوونەدەرەوە بێ پێویستی بریتییە لە کەللەڕەقی و کرێتی.

**بریسکە: گێتی دەچەرخێ نۆرەی دڵخۆشی تۆش دێ**

## مرواریی حەوتەم: مردن نەك حەرام

ئەگەر ڕۆژێکت لێ تەنگ و تووش هات شپرزە مەبە
زۆرت ڕۆژگاری خۆش و سانا بردووەتە ســـــەرێ

**لە فەرموودەیەکدا لە عەبدوڵای کوڕی عومەری کــوڕی خــەتـابەوە (ڕەزای خــودای لێ بێ)، گێڕاویەتیەوە - لەبارەی ئەو سێ کەسەی کە لە نێو ئەشکەوتێکدا شەویان بەسەردا هات و بەردێك لە شاخی داکەوت و زارکی ئەشکەوتێی لێ گرتن، ئەوانیش بەو کردەوە چاکانەی کە کردبوویان لەبەر خودا پاڕانەوە. جا کەسی دووەم، گوتی: خودایە بە خۆت دەزانی ئامۆزایەکم هەبوو خۆشەویستترین کەسم بوو - لە گێڕانەوەیەکی تردا ــ تا دوا پلە ئەوینداری شەیدای بووم، دەموویست کارێکی وای لەگەڵدا بکەم بەڵام ئەو هەرگیز لێنەدەگەڕا، تا ساڵێکیان ماڵێ ئەو ئامۆزایەم هەژار و دەستکورت بوون، ئامۆزایەکەشم هاتە لام، منیش سەد و بیست دینارم دایێ بەو مەرجەی لەگەڵم جووت بێ، ئیدی لێی چوومە پێش و مرخم لێ خۆش کرد ــ لە گێڕانەوەیەکی تردا۔ لەگەڵی ڕاکشام، ئامۆزاکەم گوتی: کوڕە لە خودای بترسێ و کارەکەی مەترازێنە، ئەو کچە چەندە لە خودا ترس بوو، لە خۆیڕا خراپەی دەست پێنەکرد، کاتێك هەژاری تەنگی پێهەڵچنی و ناچار**

بوو هێشتا هەر خودای بەبیر ئامۆزاکەی دەهێنایەوە، هەستی ئیمانی کابراشی بزواند، تا ئەگەر بیەوێ بە حەڵاڵی بۆ یەك بن و، تووشی شەڕواڵپیسی نەبن، کابراش وریا بووەوە و تۆبەی کرد و بۆ لای خودا گەڕایەوە، ئەم کردەوەی ئەم پیاوە بووە هۆی ئەوەی لەم ڕۆژەدا گاشەبەردەکە مەودایەك لە زارکی ئەشکەوتەکە بەربدا.

درەوشانەوە: فێربە چۆن لەگەڵ ترس هەڵسوکەوت دەکەی، ئیدی ترسەکە بەخۆی نامێنێ.

ناوبڕ: تام و چێژی گوناهان ڕۆیی و تفت و تاڵی پەشیمانی مایەوە.

**بریسکە: ژیانت بەرهەمی دەستی بیرۆکەکانتە**

## مرواریی هەشتەم: چەند ئایەتێك و درەوشانەوەیان

من لە ڕۆژگاری ژیانی خۆم ئەو ئەزموونەی فێر بووم کە ئـــارام گرتن پاشەڕۆژێکی بــاش و چاکی هەیە.

**خودای مەزن دەفەرموێ: [سَيَجْعَلُ اللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا] (الطلاق :٧) واتە: بێگومان خودا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت.**

**[يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ] (آل‌عمران :٢٠٠)**

**واتە: ئەی ئەوانەی کە بڕواتان هێناوە خۆگربن و(لە خۆگری دوژمن) خۆگرتر بن و لە سەنگەردا ئێشك بگرن و لە خودا بترسن بۆ ئەوەی ڕزگار بن.**

**[وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ. الَّذِينَ إِذَا أَصَابَتْهُمْ مُصِيبَةٌ قَالُوا إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ] (البقرة :١٥٦)**

**واتە: جا مژدە بدە بە خۆڕاگران. ئەوانەی کە لەگەڵ دووچاری سەختی یەك بوون دەڵێن ئێمە هەر هیی خوداین و هەر بۆلای ئەو دەگەڕێینەوە.**

[وَهُوَ الَّذِي يُنَزِّلُ الْغَيْثَ مِنْ بَعْدِ مَا قَنَطُوا وَيَنْشُرُ رَحْمَتَهُ وَهُوَ الْوَلِيُّ الْحَمِيدُ] (الشورى :٢٨)

واتە: خودا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ لەپاش ئەوەی کە خەڵکی نائومێد بوون و (بارانی) ڕەحمەتی خۆی بڵاو دەکاتەوە و هەر ئەو پشتیوان و سوپاس کراوە.

[قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ] (الزمر :١٠)

ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بڵێ بەو بەندانەم کە باوەڕیان هێناوە لە (سزای) پەروەردگارتان خۆ بپارێزن کەسانێ لەم دنیایەدا چاکەیان کردووە پاداشتی چاکیان بۆ هەیە و زەوی خودا فراوانە بەڕاستی تەنیا دان بەخۆداگران بێ ژمارە پاداشتیان دەدرێتەوە.

خودا لەباوەگۆی یونس دا فەرمووی: [وَذَا النُّونِ إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْهِ فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ] (الأنبياء :٨٧)

واتە: (باسی) زەننون (یونس بکە کە پێغەمبەری خەڵکی نەینەوا بوو) کاتێ ڕۆشت بە تووڕەیی (گەلەکەی بەجێ هێشت) وای دەزانی ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین، جا لە تاریکیەکاندا (تاریکی شەو و دەریا و ناوسکی نەهەنگ) هاواری کرد (ئەی خودا) بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە تۆ پاکی و بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم.

ئا ئەمە قورئانە و بانگهێشتت دەکا تا شادمان و دڵنیا بی، پشت بە خودای خۆت ئەستوور بکەی، سینەت بە پەیمانی خودای گوشاد بێ، چونکێ خودا ئەم خەڵکەی بۆ سزادانێ دروست نەکردووە، بەڵکو بۆ پاك و پوخت کردن و فێرکردنێ دروستی کردوون، خودا لە دایبابی مرۆ بەزەییترە، لەو خودایەی داوای سۆز و بەزەیی و میهرەبانی و ڕەزامەندی بکە، ئەویش بە زکر و سوپاسگوزاری و قورئانخوێندن و شوێنکەوتنی پێغەمبەریﷺ.

درەوشانەوە: خۆت ئامادە کە بۆ ڕوودانی خراتر ئەوکاتی هەست بەوە دەکەی چەند باشی.

ناوبڕ: دەرگەی وەڵامدانەوەی پاڕانەوەت بە تاوانان گاڵە(داخستن، قەپات) مەدە.

**بریسکە: بۆ پایە و ڕێزی ئافرەت ئەوەندە بەسە دایکی پێغەمبەرﷺ ئافرەت بوو.**

## مرواریی نۆیەم: خوداناسی غەم و خەفەتان ناهێڵێ

ئەگەر خۆشەویستیت ڕاست بێت هەموو شتێ ئاسانە
هەمـــــوو ئەوەی لەســـەر خـۆڵە دەبێتەوە خۆڵ

**خودا لەهەموو دەستکراوان دەستکراوەترە، لەهەموو بەخشندان بەخشندەترە، پێش ئەوەی بەندە داوا بکا لەوەی زیاتریش کە دەیەوێ دەیداتێ. خودا سوپاسی کردەوەی بچوك دەکا و گەورەشی دەکا. لە تاوانی زۆر خۆش دەبێ و ڕەشی دەکاتەوە، هەموو ڕۆژێ ئەوەی لە ئاسمان و زەوییە داوای لێ دەکەن، هەموو گیانلەبەرو زیندەوەران لەئاسمانەکان و زەوییدا بەردەوام بەگوفتار و بەزمانی حاڵ، داوای پێداویستی و داخوازییەکانیان لەپەروەردگار دەکەن، هەموو ڕۆژێك و هەموو کاتێك. سەرقاڵ نابێ و کەس فەرامۆش ناکا، لەو هەموو داوا و خواستە هەڵە ناکات و تێکەڵیشیان ناکا. لە ناورانەوە و لالانەوە بێزار نابێ، تەنانەت ئەوانەی داواکانیان زۆر دەڵێنەوە. بگرە ئەوانەی خۆشدەوێ کە زۆر داواکانیان دەڵێنەوە، پێی خۆشە داوای لێ بکرێ، هەر تووڕە دەبێ ئەگەر داوای لێ نەکرێ، بەو مەزنییەی خۆی شەرم لە**

بەندەی خۆی دەکا، کەچی بەندە شەرم لەو ناکا. بەندەی خۆی دادەپۆشێ کەچی بەندە خۆی داناپۆشێ، بەزەیی دێتەوە لەکاتێکدا بەندە بەزەیی بەخۆیدا نایێتەوە، دڵ چۆن خۆشی نەوێ کە هەموو چاکەیەك لەوەوەیە، تەنیا ئەو خراپەکان لادەبا، هێ لە خودای کەس نییە وەڵامگۆی پاڕانەوە بێ و، شکست نەهێڵێ و لە تاوانان خۆش بێ و، نەنگیەکان داپۆشێ و دەرد و بەڵا لابدا و بە هانای لێقەوماوان بچێ و بەردەوام ببەخشێ.

خودا... لەهەموو سەخییان دەستکراوەترە، لە هەموو ئەوانە میهرەبانترە کە خەڵکی ئومێدی میهرەبانیان پێی هەیە، لە هەموو ئەوانە بەخشندەترە کە خەڵکی چاویان لێیانە. لەهەموو ئەو پەناگیرانە بەرزترە کە خەڵکی هانایان بۆ دەبەن، ئەو بەندەی پشتی پێ ببەستێ ئەوی بەسە، لە دایك بۆ منداڵی خۆی بەزەیترە، بۆ تۆبەی تۆبەکار لەو کەسە شادترە کە وشتری بە بارەوە لێ ون بووە و خواردن و خواردنەوەشی لەسەرە لە چۆڵەوانییێك کە ئومێدی ژیانی نەمێنێ دواتر بیدۆزێتەوە.

درەوشانەوە: با بڕیارت بۆ ئەوەی هەوڵ بدەی بۆ گەیشتن بە بەختەوەری لە خودی خۆیدا ئەزمونێکی دڵخۆشکەر بێ.

ناوبڕ: هەلی قسەکردن بدە ئەوانی دی ئەوجا بۆچوونی خۆت بڵێ.

**بریسکە: هەروا خودا نموونەیەکی تری هێنایەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە (بە) ژنی فیرعەون.**

## مرواریی دەیەم: ڕۆژە پیرۆزەکە

ئەگەر ڕۆژی ڕەشت لێ داهات ئارام بگرە
هـــــەر خـــــــودا خۆشـــــــی دێنێ

**ئەزموونی بکە دوای ئەوەی نوێژی بەیانیت کرد بە ترس و خاکەڕایی ڕوو لە قیبلە دە خولەك یان نیو سەعاتێك دانیشە، زۆری زیکر و دوعا بکە، داوا لە خودای بکە ئەمڕۆت ڕۆژێکی خۆش و پڕشنگدار بێ، ڕۆژێکی پیرۆز و پڕ لە شادی بێت، ڕۆژێك پڕ لە سەرکەوتن و چاکە و سەربەرزی بێت، ڕۆژێکی دوور لە غەم و قەیران و ئاریشە و بەربەست، ڕۆژێکی پڕ لە ڕۆزی حەڵاڵ و زەلاڵ بێ و خێر لە هەموو لاوە ڕوو بکا و لە بەڵای ناگەهان دوور بێ، ڕۆژێك بێت هەرچی غەم و خەفەت و دڵئازاری چییە تێیدا نەبێت، هەیە دڵخۆشی، هەیە ڕۆزی، لە خودا داوا دەکا. ئەم دانیشتنە ـ بە ئیزنی خودای ـ دەستەبەری ئامادەییتە بۆ ئەم ڕۆژە پیرۆز و بەسوودە.**

**ئامۆژگاری کراوە ئەگەر لە ئیش تەواو بووی یاخود بێکار دانیشتبووی گوێ لە هەندێ قورئان بگرە، جا لە شریت بێ یان لە پەخشی کەناڵەکان بێ، بە دەنگی قورئانخوێنێکی لەخوداترس و**

دەنگخۆش، با قورئانخوێنەکە چەند ئایەتێکی قورئانێت بە گوێدا بچرپێنێ و، تۆش گوێی بۆ بگرە و ملکەچ بە، هەرچی غەم و خەفەت و گومان و ناڕەحەتی هەیە بەو قورئانە بیشۆرەوە، بەم جۆرە دەگەڕێیەوە سەر بارودۆخی جاران و سەر و دڵت دەبیتەوە.

درەوشانەوە: گرنگی بەو شتانە مەدە کە ناتوانی جێبەجێیان بکەی، لەبری ئەوە خۆت بە چاککردنی ئەو شتانە بەسەر ببە کە دەتوانی چاکیان بکەی.

ناوبڕ: حیجابەکەت لە هەوری بەر تاوێ جوانترە.

دوڕ هەیە لە دوکانی زێڕ و زیو ناودێر و ناسراوە، بەپارە دەکڕدرێ و لە مل دەکرێ، ئێمە ئەو جۆرەمان ناوێ و مەبەستمان نییە، ئەوەی ئێمە مەبەستمانە ئەو دوڕەیە کە تاجی سەربەرزی ئافرەت دەخەملێنێ و دەیڕازێنێتەوە، تاوەکو ئەم ئافرەتە بکاتە بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا، ئەوانیش ئەم دوڕە بەرز و ئامانجە ماقوڵ و ئەدگارە جوانانەن: ئاین و ڕەوشت، ڕاستگۆیی و خۆگری، وەفا و تۆبە، مەبەست و کردار.

**بریسکە: گەلۆ سەرکەوتنی خودا نزیکە**

## دوڕی یەکەم: ژنێکی تێگەیشتوو بریتییە لە ژیانێکی بەختەوەر

لەوانەیە خودا وچانێکی خۆش بێنێت چونکە
خودا هەموو ڕۆژێ باری باشتر دێنێتە پێش

**لەسەر ئافرەت پێویستە زۆر بەجوانی پێشوازی لە هاوسەرەکەی خۆی بکات... کاتێ پیاوەکەی دێتەوە ماڵێ. ئەگەر دیتی پیاوەکەی مرومۆچ و بێتاقەت و ماندووە پێویست ناکا ژنەش ڕووگرژ بکا، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێ بەپیرییەوە بچێ و بزانێ چی دەوێ بۆی بکا، بێ ئەوەی کابرای پرسیار باران بکا و، لێی بپێچێتەوە، ئەوە بۆ ئەوا نێوچەوانت تێکناوە؟ دوای ئەوەی کابرا دانیشت و خۆی تەنا کرد، ئەوکات بەخۆی هەگبەی هەڵدەڕێژێ و چی هەبێ باسی دەکا. ئەگەر واش نەبوو ئەو کاتی ئاساییە ژنە بە زمانێکی نەرم و شیرین لە کابرای بپرسێ و لە دوودڵی کابرای کەمبکاتەوە.**

**ئەگەر ئافرەتەکە زانی دەتوانێ هاوکاری پیاوەکەی بکات و چارەی ئەم کێشەیەی بۆ بکات، دەشێ دەستپێشخەری بکات و چی لە دەستی دێ بیکا، ئەو زەحمەتییەی لە ئەستۆی پیاوەکەیە سوك و**

سانای بکا.. ئەو کاتیش پیاوەکە دەزانێ لەماڵەوە چ گەوهەرێکی بەنرخی هەیە تەنانەت لە هەموو گەوهەرەکانی دونیایێ بەنرخترە.

درەوشانەوە: نائومێد مەبە لەو کارانەی کە بە پایانت نەگەیاندوون پێویستە بزانی کاری مرۆڤە مەزنەکان هەرگیز تەواو نابێ.

ناوبڕ: خۆر دەدرەوشێتەوە، ئەستێرەکان تریفە داوێن، هەسارەکان هەڵاتوون کەوابێت بۆ دڵتەنگی؟!

**بریسکە: خودا ئەگەر کەسانێکی خۆش بوێ دووچاریی بەڵایان دەکا**

## دوڕی دووەم: تەنیا بۆ ئەمڕۆت کار بکە

ئەوانە هەرگیز وادانانێن کە بەڵا لە دوای خۆشی نایێ پێشـــیان وا نییە بـــەڵا لێدانێکی گورچـکبڕە

**یەکێ لە بەختەوەرەکان دەبێژێ:**

**ڕۆژی پڕشنگدار ئەو ڕۆژەیە کەوا ئێمە جڵەوی ژیانی خۆمان لەدەست خۆمان بێ، نەوەك دونیا دەست بەسەر ئێمەدا بگرێ، ڕۆژی جوان ئەو ڕۆژەیە، کە حەز و ویست و ئارەزووی خۆمان لەبن دەستی ئێمە بێ، نەوەك ئێمە گوێ لە مستی ئەوان بین.**

**یەکێ لەو ڕۆژانەی کە هەردەم لە یادمە و بیرم ناچێتەوە:**

**هەر ڕۆژێك کە بەسەر خۆمدا زاڵ بووبم و خۆم لە چوارچێوەی گومانی ئەوەی کە دەتوانم چ بکەم و ناتوانم چ بکەم دەرهێنا بێ، ئەو ڕۆژەم یەکێك بووە لە ڕۆژە هەرە جوانەکان.**

**ئەو ڕۆژە چ جوانە کە تێیدا دوودڵ بووم لەنێوان پێداهەڵگوتنی خەڵك و ئەو کارەی کە هیچ کەس پێی نەزانیووە. مەدح و سەنای خەڵکم پشت گوێ خست و بەکرِی کارە چاکەکەم کرد، لەکاتێکدا**

هیچ که‌سێك پێ نه‌زانیووه‌ و نه‌یبستووه‌.

ئه‌و ڕۆژه‌ چه‌ند جوان بوو که‌ گیرفانم پڕ پاره‌ بوو، که‌چی ویژدانم ئاسووده‌ نه‌بوو، بۆ ئه‌وه‌ی ویژدانم ئاسووده‌ بێت ده‌ستم له‌ جه‌رگم نا و ئه‌وه‌ی لام بوو به‌خشییم.

ئه‌و ڕۆژانه‌ جوانن، جوانتر له‌و ئه‌وه‌ بوو که‌ به‌شی دونیاییم زۆر که‌م بوو، به‌ڵام به‌شی عیرفانییم( ڕۆحی) به‌قه‌ده‌ر ئه‌و کرده‌وه‌یه‌ بوو که‌ کردبووم، الحمدلله ئه‌و شته‌ بۆ من زۆر و زه‌وه‌نده‌.

دره‌وشانه‌وه‌: دڵخۆش به‌ به‌وه‌ی هه‌ته‌ و ڕازی به‌ به‌وه‌ی خودا پێی داوی. واز له‌ خه‌یاڵ پڵاوی بێنه‌ که‌ له‌گه‌ڵ کۆشان و توانات ناگونجێ.

ناوبڕ: نوێژ باشترین شته‌، له‌ کاتی وه‌ڕه‌زی و ته‌نگانه‌ به‌هاوارت دێ.

بریسکە: خودا لەوەی ڕابردووتان خۆش بوو.

## دوڕی سێیەم: واز لەو هەستەی بێنە کە پێت وایە چەوساوەی

خۆشییت دی و تامت کرد، هەموو بارێك کۆتایی هەیە،
هـــــەروەکو چـــۆن ســــــەرەتاییەکیشیان هەبوو

**(وازهێنان لە هەستی کەساسی) سیفەتێکی ناوازەیە کە یارمەتیت دەدا بۆ نەهێشتنی دوودڵی و سەرکەوتنت لە ژیاندا و وات لێ دەکا دۆستانە بیت و لەگەڵ خێزانەکەشتدا شادومان و بەختیار بیت، چونکە ئەگەر کەسێك خاوەنی ئاسۆیەکی فراوان بێ، بەجوانی لە سروشتی خەڵکی تێدەگا و گۆڕانکارییەکان دەخەملێنێ و خۆی لەبری کەسی بەرانبەر دادەنێ و، بارودۆخە شاراوە و ئاشکراکان هەڵدەسەنگێنێ.**

**سەبارەت بە بابەتی دوودڵی، ئەو کەسەی گۆشەنیگایەکی دووری هەبێت، لە شتەکان باش تێدەگا، کە تووشی کێشەیەك دەبێت دەزانێ چ بکا یان کە حەزێکی بۆ نایەتە دی، بە ئاسایی وەریدەگرێ. سروشتی ژیانیش ئاوایە هەموو شتێ بە خواستی کەسێك نابێ. لەوانەیە مرۆڤ ڕکی لە شتێك ببێتەوە، بەڵام ئەو شتە خێری ئەوی تێدایە، لەوانەشە دڵی بە شتێك خۆش بێت و زیانی ئەوی تێدا بێ، ڕاستییەکەی خێر تەنیا لەو شتەیە کە خودا هەڵیدەبژێرێ.**

ئەوەی خاوەن ئاسۆیەکی فراوانە دەرك بەوە دەکا ئەو بەشێکە لەو گەردوونە فراوانە و پشکی خۆی لە غەم و ئازار و خۆشی هەیە، ئەو شتە نە شتێکی لەناکاووە و نە هی ئەوەشە خەفەتی بۆ بخۆی، ئەوە لەسەرڕووی ئەو شتانەوەیە و هێ لە کەسی کورتبین، کەسانی بیرکراوە هەرگیز هەست بە گرێکوێرەی ستەملێکردن ناکەن، چونکە کورتبین پێی وایە ئەو شەڕ و کێشەیە تەنیا بەرۆکی ئەوی گرتوە و هەموو خەڵکی ستەم لەو دەکەن یان پێی وایە هەموو دەمێ نێوچەوانی سێزدەیە. بەڵێ، کەسی دووربین هەرگیز شتی وای بە خەیاڵدا نایێ بەڵکو ئەو هەست بە سروشتی بوونی ژیان دەکات و دەزانێ ئەو ئاریشە و بەربەستانە بەشێکن لە ژیان بۆیە دوای ئەوەی ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دا بۆ بەدیهێنانی باشترین بە ئەنجامی شتەکان ڕازی دەبێت.

درەوشانەوە: هەر ئێستاکە دڵخۆش بە نەك سبەی.

ناوبڕ: لە بەدگومانی دوورکەوە دەحەسێیەوە.

**بریسکە: ئەك سلاوتان لێ بێت ئارامتان گرت**

## دوڕی چوارەم: ئای سەرکەوتن دوای هەوڵ و ماندووبوون چەند خۆشە!

تــەنگــانە دێ و دوای ئــــــەوە
خۆشی دێ و تەنگانە ناگەڕێتــەوە

**یەکێ لە کەسە سەرکەوتووەکان دەڵێ:**

**بە هەژاری لەدایك بووم و هەر لەسەر لانکێ بووم دەستکورت بووین، زۆرم تامی تاڵی نوزانەوە بۆ پارچە نانێك لە دایکم چەشت، لە کاتێکدا دایکم هیچی لا نەبوو بمداتێ، پەلکە نانێکی وشکی شك نەدەبرد، لە تەمەنی دەساڵی ماڵم بەجێهێشت، لە یازدە ساڵی دەستم بە ئیشێ کرد، لەو هەموو ساڵە تەنیا یەك مانگ خوێندم، دوای تەمەنی یازدە ساڵی پڕ لە ئیش و کاری سەخت دوو سەر مانگا و شەش سەر مەڕ و ٨٤ دۆلارم هەبوو. لە هەموو تەمەن خۆم یەك فلس چییە بۆ خۆشی خۆم سەرفم نەکردبوو، لەوەتی پێرۆکە بووم تا تەمەنی بیست و یەك ساڵی هەر درهەمێکم پەیدا کردبێ هەمووم هەڵدەگرت.. بە مانای وشە تامی ماندووبوون و شەکەتییم کرد و چەندان میلم دەبڕی و دەڕۆیشتم تا برا مرۆڤەکانم ئیشێکم بدەنی و پێی بژییم. لە یەکەم مانگی دوای تەمەنی بیست و یەك ساڵییم چوومە دارستانێك تا عارەبانەیەك بە جووتە گایەکان**

لێبخورم و دار و باری سوتانێ ببرم، پێش ڕۆژهەڵاتێ لە خەو هەڵدەستام هەتا دونیا تاریك دادەهات ئیشێکی قورس و زەحمەتم دەکرد، لەپێناو ئەوەی سەری مانگ شەش دۆلاران وەربگرم، هەر یەکێ لەو دۆلارانە دەتگوت مانگی تابانە لەنێو جەرگەی شەوی تاریك و ئەنگوستەچاو.

درەوشانەوە: ئەگەر لە ڕۆژانی ڕابردوو هەڵەیەکت کرد، شتێکی لێ فێر بە، دوای ئەوەی پەندێکت لێ وەرگرت پشت گوێی بخە و تەواو.

ناوبڕ: باوەڕ غەم لادەبا و خەفەت ناهێڵێ.

بریسکە: بڵێ : هەر خودا ئێوە لەو مەترسییە و لە هەموو ناڕەحەتی و غەم و پەژارەیەك ڕزگار دەکات .

## دوری پێنجەم: لەگەڵ بارودۆخی خۆت ڕادێی

لە هەموو وڵاتێك وایە کەسێك لەنێو دۆستانی غەریب بێ
مـــــادام داوا زۆر هـــــەبێ هاوکار کەم دەبێت

پیاوێك دەناسم لە نەشتەرگەریەکدا قاچێکی بڕایەوە، منیش بۆ دڵدانەوە و کەمکردنەوەی ئازارەکانی چوومە لای، ئەم پیاوە کەسێکی ژیر و زانا بوو. لە دڵێ خۆم گوتم پێی دەڵێم: ئومەتی ئیسلام چاوەڕێی لە تۆ نییە، ببیتە ڕاکەرێکی چاپوك، یان زۆرانبازی شەڕ، بەڵکو ئومەت چاوی لە بڕوا و ئەندێشەی گەشی تۆیە، سوپاس بۆ خودا ئەوەشت لەدەست نەداوە. کاتێك چووم و سەردانم کرد، پێی گوتم: سوپاس بۆ خودا قاچم دەیان ساڵ بە جوانی هاوڕێم بوو، من بەسەلامەتی ئاینەکەم دڵم ئاوێ دەخواتەوە و ئاسوودەم.

یەکێ لە لێزانان گوتویەتی: ئاسوودەیی فکر و هۆش هەرگیز دروست نابێ تا کەسەکە خۆی ڕادەستی خراترین ئەگەر نەکا و، سەرچاوەی ئەم قسەیەش - لە لایەنی دەروونییەوە - خۆ تەسلیمکردنە، کە چالاکی تۆ لە کۆت و بەندەکان دەردێنێ... پاشان

دەڵێ: لەگەڵ ئەوەشدا هەزاران هەزار کەس ژیانی خۆیان ڕادەستی ئەو واقیعە تاڵە ناکەن و ئەوەش دەرباز ناکەن کە پێویستە دەربازی کەن، لەبری ئەوەی هەوڵ بۆ بنیاتنانی هیواکانیان بدەن، لەنێو خۆیان لە شەڕێکی تووش و تاڵ لەگەڵ ڕابردوو ڕادەگەیێنن، مل بۆ دوودڵی دەدەن کە چ بەهرە و سوودێکی نییە.

بەداخ و کەسەرداری بۆ ڕابردووێکی شکستخواردوو گریانێکی زۆر بۆ ئەو ئازار و دۆڕانانەی بریتییە ــ لە دیدی ئیسلام ــ لە هەندێ ڕواڵەتی کوفر بە خودا و توڕە بوون لە قەزا و قەدەر.

درەوشانەوە: ڕووخان پیسترین دوژمنە، چون توانای تێکدانی ئاسوودەیی هەیە.

ناوبڕ: کەمێ لە خواردنەکەت بدە هەژاران.

بریسکە: ئێوەمان کردە گەلێکی میانەڕەو

## دوری شەشەم: چەند ئامۆژگارییەکی ڕاست و دروست لە دایکێکی ژیرەوە

چەند کەسی غەمبار و بێزارمان دی
پاشترێ دڵخۆش و شـادمان بوون.

چـــەند ئامۆژگارییەك هــەن لە باشـترین ئەو ئامۆژگاریانەن کە لە ئافرەتی عەرەب دەگێڕدرێتەوە. ئامۆژگارییەکە هی ئومامەی کچی حاریسە بۆ کچەکەی خۆی ئوم ئیاسی کچی عەوف لە شەوی بوکێنی پێی گوت و ئەوها ئامۆژگاری کچەکەی خۆی کردووە: ئەی کچە شیرینەکەم: وا خەریکە لەو ماڵە بڕۆی کە لێی گەورە بووی و لێیەوە گاگۆڵەت کرد و فێرە ڕۆیشتن بووی، دەچیتە ماڵێك کە نایانناسی، دەچییتە ماڵێك بۆ تۆ نامۆن. کچم بەهۆی ئەو مارەکردنەوە ئەم پیاوە بووەتە سەرداری تۆ، کەوابێ بە دڵی ئەو بجولێوە، خودا ژنی بۆ پیاو دروست کردووە و پیاویشی بۆ ژن دروست کردووە.

ئامۆژگاری یەکەم و دووەم: بە ڕەزامەندی خۆتەوە بەگوێی بکە، گوێڕایەڵی بە و بێ دڵی مەکە.

ئامۆژگاری سێیەم و چوارەم: لە بۆن و بەرامەت دڵنیا بە، با چاو ودڵی پیاوەکەت شتی خراپ نەبینێ و بۆنی ناخۆشت لێ نەکا.

ئامۆژگاری پێنجەم و شەشەم: لە کاتی خۆی نان و خواردنی بۆ ئامادە بکە، لە خەوی مەکە چونکە زۆر برسیەتی پشکۆیە و خەوزڕاندنیش جاڕسکەرە و مرۆڤ توڕە دەکا.

ئامۆژگاری حەوتەم و هەشتەم: چاوت لە ماڵ و خزم و کەس و منداڵەکانی بێ، ئەگەر چاوت لە ماڵ و سامانی کابرای بوو نیشانەی ئەوەیە تۆ بەو پیاوە ڕازی و ئاگاداربوونی منداڵەکانیش واتە باش بەڕێوەبردن.

ئامۆژگاری نۆیەم و دەیەم: منجڕی لە داواکارییەکانی مەکە و نهێنییەکانی ئاشکرا مەکە، چونکە ئەگەر بە گوێت نەکرد دڵی دەبێتە هەنبانەی ڕك و کینە، ئەگەریش نهێنییەکانت ئاشکرا کرد لە ستەمی دڵنیا مەبە، ئامان ئەگەر ئەو دڵتەنگ بوو خۆت خۆشحاڵ دەرنەخەی، ئەگەر ئەویش کەیفخۆش بوو تۆ نێوچەوانت تێکمەنێ و مڕومۆچ مەبە.

درەوشانەوە: بەختەوەری تۆ لەسەر کەسی دی نەوەستاوە، بەڵکو لەنێو دەستی خۆتە.

ناوبڕ: نەکەی خۆ لە کتێبە ئیلحادی و گۆڤارە پوچەکان دەی.

**بریسکە: بەیانی ڕۆژ هەڵدێ و دڵت خۆش دەبێت.**

## دوڕی حەوتەم: ئەو ئافرەتەی هەوڵ دەداو تێدەکۆشێ خودای لە خۆ ڕازی دەکا

نـــائـــومـــێد مـــەبـــە چـــونکە نـــائـــومـــێـــدی کوفـــرە بەڵکو خودا لە نەبوونی و کەمدەرامەتی دەوڵەمەندت بکا

**ئەی دەربارەی ئەو ئافرەتە جوهەنییەت نەبیستووە کە تووشی زینا بووبوو پاشان خودای بەبیر هاتەوە و تۆبەی کرد و گەڕایەوە.**

**ئەوە هێزێکی ئیمانییە کە وای لەو ئافرەتە کرد خۆی پاکبکاتەوە، زەحمەتی ئەم دونیایە هەڵبژێرێ نەك هی قیامەت، ئەگەر ئیمانێکی بەهێزی نەبوایە ئەو ئازارەی هەڵنەدەبژارد لەوانەیە کەسێ بڵێ: باشە بۆچی زینای کرد خۆ تەنیا کەسی بڕوا لاواز ئەم کارە دەکات؟ وەرام ئەوەیە: جار وایە مرۆڤ لاواز دەبێت و دەکەوێتە نێو تاوانەوە، چونکە مرۆڤ جوغزێکی بێ تینە، جاری وا هەیە دەکەوێت چونکە بەتالوکەیە، هەندێ جار بەهۆی کەموکوڕییەوە پێی دەخلیسکێ، لێ کە تۆوی بڕوا لە دڵیدا چەکەرەی کرد و بنەدارێکی بەرز و سایەدار شین بوو، ڕەگ و ڕیشەی ڕەسەن و بڕوای پتەوی دەردەکەوێ، هەر ئەوەش بوو وای لەم ژنە کرد بەپەلە خۆی بگەێنێتە پێغەمبەری خوداﷺ و داوای خۆ پاکژکردنەوە بکا، لەپێناو ڕەزامەندی و ڕەحمەت**

و لێخۆش بوی خودای ڕۆحی خۆی بەخشی.

درەوشانەوە: هەموو دەمێ یان هەر بەکەیف پرتەپرت و بۆڵەبۆلێ مەکە.

ناوبڕ: هۆی هەموو غەمان پشتکردنە خودایە کەوابێ ڕووی تێکە.

**بریسکە: کە قەیران توند بوو خێر لە ڕێیە**

## دوڕی هەشتەم: ئەو ئافرەتەی سنوورەکانی خودای بپارێزێ خوداش ئەو دەپارێزێ

ئەگەر نیعمەتێکت لە دەست چوو هیچ شـــورەیی نییە بەڵکو ئەوە عەیبەیە خۆت جوان نەکەی و خۆت پیر کەی

**دەگێڕنەوە لە ڕووداوەکەی ئەسکەندەرییە ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و دەوڵەمەند لە هەڵاتنێ دواکەوتبوو، بە خۆ و بە خزمەتکار و کەنیزەکەوە لە ماڵێ مابوونەوە. فەڕەنسییەکان بە شمشێری هەڵکێشراو هەڵدەکوتنە سەر ماڵێ و یەکیان دەنەڕێنێ: پارە و سامانەکە لە کوێیە؟ ئافرەتەکەش ــ ترسا بووــ گوتی: پارەکە لەنێو ئەو باولانەیە کە لە فڵانە ژوور دان. ماڵەکەشی پێ پیشان دا، ژنە لە ترسان هەڵدەلەرزی. یەکێ لە فەڕەنسییەکان بە ژنە گوت: مەترسێ تۆ لەگەڵ من دەبیت. بەو ماڵ و سامانەی هەیە ڕادەبوێرین، ژنە تیگەیشت ئەو پیاوە خۆشی دەوێ و دەیەوێ بۆ ئەو بێت، بۆیە خۆی لێ نزیك کردەوە و بەچرپە و ناز و عیشوەوە پێی گوت: دەمەوێ بچمە سەر ئاوێ.**

**کابراش وا حاڵی بوو ژنە مەیلی بۆ بزواوە، ئاماژەیەکی بۆ کرد تا بچێتە ئاودەستێ، ئیدی ژنە ڕۆیی و فەڕەنسیش خەریکی تاڵان و بڕی باولان بوون، ژنە لە دەرکی ماڵێ چووە دەرێ و، خۆی بە**

لەودەیەکی تاریکی پڕ کا دادا، کە لە کۆڵانەکەی خۆیان بوو، لەنێو کایەکە چاڵێکی هەڵکەند و خۆی تێدا حەشار دا، پاش دزی و تاڵانی فەڕەنسی کەوتنە سەر و سۆراغی ژنەی و نەیاندۆزییەوە. فەڕەنسی دەستکەوتی دزی خۆیان برد و ژنەش بەو ئایین و ئۆینە لە دیلی وان ڕزگار بوو، بە هەمان شێوە خزمەتکار و نۆکەرەکانیش چووبوونە سەربانێ و لە دیلی سەلامەت بوون.

پاشان ئەم ژنە دەیگوت: سەلامەتی ئاین و ناموس لەوماڵەی چاترە کە مرۆڤ هەر بۆ ئەو ڕۆژانە ماڵ هەڵدەگرێ، چونکە هەژاری لە کۆیلایەتی باشترە، نەداری لە گۆڕینی ئاین زۆر چاکترە.

درەوشانەوە: بێگومان تۆ لەم دونیایەی تووشی هەندێك شت دەبیت کە ناتوانیت بیگۆڕی، بەڵام تەنیا دەتوانیت بە ئارامی و ئیمانەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەیت.

ناوبڕ: خوشکۆڵە بێدەنگی تاجی سەرتە.

**بریسکە: دایك کارخانەی پیاوان و کانگەی پاڵەوانانە.**

## دوڕی نۆیەم : ئاوی تۆبە پاکترین ئاوە

ژیان جوانە بۆیە پێی شادمان بە
و بە جوانترین شێوە بیڕازێنەوە

**خودا تۆبەکاران و پاك و خاوێنانی خۆش دەوێ، تەنانەت بە پەژیوان بوونەوەت لە تاوانان کەیفی دێ، زۆر زیاتر لە دڵخۆشی لەو کەسەی لە چۆڵەوانییەك دایە و توێشوو و پێخۆر و خواردنەوەی خۆی لەسەر پشتی وشترەکەیەتی. لەپڕ وشتر بزر دەبێت و کابرا ناهومێد دەبێت، لە سێبەری دارێك هەڵدەتروشکێ و چاوەڕوانی مردنێ دەکا، دەبۆرژێ و پاش ماوەیەکی کەم بەخەبەر دێ، چ ببینێ؟! وا وشترەکەی لە تەك کابرای وەستاوە و خواردن و خواردنەوەکەشی لەسەر پشتە، کابرا هەڵدەستێ و جڵەوی وشترەکە دەگرێ و لە خۆشییان هاوار دەکا: ئەی خودایە تۆ بەندەی منی و منیش خودای تۆم..پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی لەو بەندەیەش زیاتر بە تۆبەی بەندەکانی شادمانە تا بەندەکانی بباتە بەهەشتێ و لێیان ڕازی بێ، خودا بەو ئایەتە بانگی بڕواداران دەکا و دەفەرمووێ: [وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ] (النوور :٣١)**

واته‌: هه‌مووتان ته‌وبه‌ بكه‌ن و بگه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ لای خودا ئه‌ی ئیماندارە‌كان تا ڕزگار و سه‌ركه‌وتوو بن.

تۆبه‌ ئه‌وه‌یه‌ دڵت به‌ فرمێسكان بشۆی و له‌ په‌شیمانیان ناخت دایسێ و، له‌ ده‌روونه‌وه‌ هه‌ست به‌ تاوان بكه‌ی و، فرمێسك شۆڕابه‌ی ببه‌ستێ. به‌ڵێ، ئه‌مه‌ سه‌ره‌تای ڕێی پیاوانی خودایه‌، سه‌رمایه‌ی براوه‌كانه‌، یه‌كه‌م هه‌نگاوی موریدانه‌، كلیلی به‌رده‌وامی خوداویستانه‌. تۆبه‌كار داماو و ملكه‌چه‌، ده‌گریێ و ناڵه‌ی دێ، كاتێ خه‌ڵكی ئۆقره‌ی ده‌گرن ئه‌و هه‌دا نادا، كاتێ خه‌ڵكی داده‌كه‌سێن ئه‌و له‌ ترسان ناسره‌وێ، به‌ دڵێكی غه‌مباره‌وه‌ له‌ قاپی خودای ڕاده‌وستێ و دڵی په‌ست و خه‌جاڵه‌ته‌، ڕه‌نگی زه‌رد هه‌ڵگه‌ڕاوه‌، ئه‌گه‌ر گه‌وره‌یی تاوانه‌كانی و گوناهه‌ زۆره‌كانی به‌ بیربێته‌وه‌، غه‌م و خه‌فه‌ت دایده‌پۆشێ، ئاگر له‌ هه‌ناوی به‌رده‌بێ و، فرمێسكی دێته‌ خوارێ و به‌ هه‌ناسان ئاگری ده‌كاته‌وه‌، به‌هۆی كه‌فوكوڵی دڵی هه‌نسك ده‌یگرێ، خۆی ئاماده‌ ده‌كا به‌ڵكو بتوانێ له‌ دواڕۆژ سه‌ركه‌وتوو بێ، له‌م دونیایه‌ سوكه‌ڵ و چاپووك ده‌بێ تا بتوانێ به‌په‌له‌ به‌سه‌ر پردی سیڕاتێدا تێبپه‌ڕێ.

دره‌وشانه‌وه‌: به‌ شێوازی ئه‌رێنی و گه‌شبینانه‌ بیر بكه‌وه‌ ئه‌گه‌ر ڕۆژێك شته‌كان به‌ لار و وێری هاتن ئه‌وه‌ پێشه‌كی هاتنی ڕۆژانێكی نزیكن كه‌ پڕاوپڕن له‌ خۆشی و شادی.

ناوبڕ: ئه‌وه‌ی له‌سه‌ر شانۆ خۆی ڕووت و قوت كردووه‌ته‌وه‌ سبه‌ی چ جوابێكی خودا ده‌داته‌وه‌!

**بریسکە: جا ئافرەتە چاکەکان (ئەوانەن) گوێڕایەڵی بەردەوام، پارێزەری (داوێنی خۆیان و سامانی مێردەکانیان)ن کە مێردەکانیان لە ماڵەوە نەبن.**

## دوری دەیەم: یەکەم گیانفیدا

لەوانەیە کەسێك شتێکی لـە دڵ گــران بێ و حەزی لێ نەبێ، کەچی ئاکامێکی باشی هەبێ

**لە سەردەمی خۆیدا لە نایابترین کۆشك دەژیا، چەندان کەنیزە و بەندەی ژن و پیاوی لەژێردەستی بوو، ژیانێکی بە دڵی خۆی و پڕ ناز و نیعمەتی هەبوو.**

**ئەوە ئاسیای کچی موزاحیمی خێزانی فیرعەون بوو - ڕەزای خودای لێ بێ - تاکە ئافرەتێك لە ڕووی جەستەوە لاواز بوو، لە کۆشکەکەی خۆیدا دەژیا و هەرچی کێشە چییە نەیبوو، نووری ئیمان لە دڵیدا دەرکەوت، ئالنگاری ئەو واقیعە نەزانییە بوو کە مێردەکەی خۆی سەرکردایەتی دەکرد.**

**تێڕوانینێکی سەرکەشانەی هەبوو، پشتی لە کۆشك و ڕایەخی نەرم و ئاوریشم کرد، وازی لەو ژیانە خۆشە و کەنیزە و خزمەتکار هێنا، بۆیە شایەنی ئەوەیە خودا لە قورئانێ باسی بکات، وەکو نموونەیەك بۆ ئەوانەی بروایان هێناوە، ئەوەتا خودا خۆی دەفەرمووێ: [وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ] (التحريم :١١)**

واتە: هەروا خودا نموونەیەکی تری هێنایەوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە (بە) ژنی فیرعەون کاتێك گوتی: پەروەردگارم لای خۆت، لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دروست بکە و ڕزگارم بکە لە فیرعەون و کردەوەکانی، ڕزگارم بکە لە گەلی ستەمکاران.

زانایان لە تەفسیری ئەم ئایەتە پیرۆزە فەرموویانە: ئاسیا دراوسێی پێش خانوو هەڵبژارد، هەروەتر ئەو شایستەی ئەوەیە پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی ناوی بێنێ کە بە پایەی تەواوی (کمال) گەیشتوون، هەروەکو دەفەرمووێ: ((کمل من الرجال کثیر و لم یکمل من النساء الا اسیة امراءة فرعون و مریم بنت عمران، و ان فضل عائیشة علی النساء کفضل الثرید علی سائر الطعام)). واتە: (زۆرن ئەو پیاوانەی گەیشتوونەتە پلەی تەواویی (کمال ـ پێغەمبەرایەتی/ وەرگێڕ) لە ئافرەتانیش هەر ئەمانە بێ کەموکووڕی بوون: ئاسیای هاوسەری فیرعەون، مەریەمی کچی عیمران، پایەی عائیشەش لەسەر ژنانی دی وەکو پایەی تێکوشەیە لەسەر خواردنەکانی دیکە( لە فەرموودەی تردا ئافرەتی دیکەشی لەگەڵ دایە/ وەرگێڕ)).

ئەو ئاسیایە ئیماندارە چرایەك بوو، تاریکایی کۆشکەکەی فیرعەونی ڕۆشن کردەوە، ئەی کێ چرایەك بۆ ئێمە دادەگیرسێنێ و بە نووری ئارامی و هەدادانەوە ئێمە بۆ لای خودا بانگ دەکات؟

درەوشانەوە: تەنیا بیرۆکەکانت کۆنترۆڵ بکە ئیدی بەختەوەر دەبیت.

ناوبڕ: ماڵێ خۆت گەورەترین شانشینە بە زیکری خودای ئاوەدانی بکەوە.

هەرچەندە ئافرەت هونەر بنوێنن بۆ ئەوەی بگەن بە باشترین و باڵاترین جوانکاری لەپێش ئەو ئافرەتانە کۆمەڵێ ئافرەتی تر هەبوون، کە زێڕ و زیویان زۆر و بێ ئەژمار بووە لەو ئافرەتانە: شەجەرەتودەڕ، شیرین، کیلۆپاترا، کریستیانا ئۆنیسس و دیانە، بەڵام ئەمانە بە شەرمەزاری و حەسرەتکێشی و نائومێدی مردن، بۆیە پێویستە ئافرەت بەدوای جوانکاری دیکەدا بگەڕێ لە کۆگەی سروش(الوحی) و لە عەمباری شەریعەتی پاکدا.

**بریسکە: ڕەحمەتی خودای لە چاکان نزیکە.**

لەوانەیە خودا شیفای ئازارەکانت بدا چونکە
ئەو خودایە بۆ بەندەکانی خۆی غەمڕەوێنە

**ئەو ئافرەتانەی چاویان بە قەدەری خودای لێك دەنێن و ڕازین بە بەشی خۆیان هەرچەند زریانی کێشە و گرفت دەوری داون و سەدان بەڵا ڕووی تێکردوون، هێشتا غەم دەرچەیەك نابینێتەوە تا بگاتە دڵیان. هەرگیز لێناگەڕێن فرمێسك لە چاویان بمێنێتەوە، بۆ ئەو ئافرەتانەی کوڕ و ئازیز و باوان و دۆستانیان لە دەست داوە، بە هەموو بڕوادارێکی غەمبار و بە هەموو کارەساتبار و کۆستکەوتووێك دەڵێم:**

**خودا پاداشتی نەبڕاوەتان بداتەوە و پلەوپایەتان بەرزکاتەوە و دوا ناحۆشیتان بێ، خودا دەفەرمووێ: [وَاسْتَعِينُوا بِالصَّبْرِ وَالصَّلَاةِ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى الْخَاشِعِينَ] (البقرة :٤٥)**

**واتە: پەنا ببنە بەرئارام گرتن ونوێژ(بۆ گەیشتن بە مەبەست) و بێگومان نوێژ(ئەرکێکی) گەورەو گرانە مەگەر لای ئەوانە نەبێ کە لە خودا دەترسن، واتە خۆیان بەزل نازانن.**

پێشەوا عەلی(علیه السلام) فەرموویەتی: ((ئارامگرتن بۆ باوەڕ وەکو سەرە بۆ جەستە)). موژدەی پاداشتی قیامەتێت دەدەمێ لە فیردەوس و لە نزیکی خودای تاك و تەنیا لە بەهەشتی نەبڕاوە و لە نشیمەنی پەسەند، لە پاداشتی ئەو شتانەی لە پێش خۆتان ناردوویانە و ڕەنجیان کێشاوە و بەخشیوویانە، ئەك ئەو باوەڕ و ئارامگرتنەتان پیرۆز بێ، لەمەودوا دەزانن ئێوە بە هەموو جۆرێك براوەن [وَبَشِّرِ الصَّابِرِينَ] (البقرة:١٥٥) واتە: جامژدە بدە بە خۆڕاگران.

دەروشانەوە: با تەمەنت هەرچەندێ بێ، بڕوابەخۆبوون مانایەکی زیاتر بە ژیانت دەدا، وات لێ دەکا هەوڵی زیاتر بۆ ئەم ژیانەت بدەی.

ناوبڕ: نوێژێکی وا بکە لەگەڵت بێتە نێو گۆڕ.

**بریسکە: خودا بۆ بەندەکانی خۆی دلۆڤانە**

## زەبەری دووەم: کوێری ڕاستەقینە کوێری دڵە

ڕۆژگار چییە؟ جگە لە ناخۆشییەك و نەمانی ناخۆشی تەنگانەیەکە و دەرووی خێری بەدوا دێت

**پیاوێکی کوێر هەبوو لەگەڵ خێزانە دڵسۆزەکەی و کوڕە باشەکەی و دۆستە وەفادارەکانی دەژیا، تاکە شتێ کە بەری لەبەر خۆشی ئەم پیاوە گرت بوو ئەو تاریکاییە بوو، هەردەم هیواخواز بوو ڕۆشنایی ببینێ تا بە چاوانی خۆی ئەو خۆشی و شادییە ببینێ.**

**دکتۆرێکی بلیمەت هاتە شاری ئەم کوێرە و نیشتەجێ بوو، کوێرە بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە لای دکتۆر و داوای دەرمانێکی لێ کرد تا بینایی بۆ بگەڕێتەوە. دکتۆر قەترەیەکی دایێ و پێی گوت: ئاواوئاوا و بەرێکی بەکاریبێنە، پێشی گوت بەو قەترەی ئەگەری هەیە لەپڕ ڕووناکی ببینی و چاوت چاك ببێتەوە. کوێرە لەسەر بەکارهێنانی دەرمانەکە بەردەوام بوو، هەرچەند دەوروبەرەکەی نائومێد بوون، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك لە بەکارهێنانی دەرمانەکە، کابرای مجرۆ لە باخچەیماڵی خۆیان دانیشتبوو لەناکاو ڕۆناکی دیت وەخت بوو لە خۆشییان شێت بێ، بە گورگەلۆقان ڕایکردە ژۆرێ هەتا بە خێزانەکەی**

بلێ به‌ڵام چ ببینێ؟! وا خێزانه‌که‌ی له‌گه‌ڵ براده‌رێکی خۆی ڕاکشاوه و ناپاکی له‌و ده‌کا، بڕوای به‌ چاوی خۆی نه‌کرد هه‌ڕایکرده ژووره‌که‌ی دی، بینی کوڕه‌که‌ی وا خه‌ریکه پاره‌ی ماڵی خۆیان ده‌دزێ، کابرا به ڕێی خۆیدا گه‌ڕاوه و هاواری کرد: ئه‌وی ئه‌و ده‌رمانه‌ی دامێ دکتۆر نه‌بوو، جادووگه‌رێکی نه‌فره‌تلێکراو بوو، مێخێکی ده‌ست دایێ و له چاوی خۆی چه‌قاند و خۆی کوێر کرده‌وه، به‌ بێ ترس و داخورپانه‌وه گه‌ڕایه‌وه سه‌ر ئه‌و خۆشییه‌ی که لێی ڕاهات بوو.

دره‌وشانه‌وه: ڕاڕایی له ده‌روونداا له نه‌خۆشییه جه‌سته‌ییه‌کان کوشنده‌تره.

ناوبڕ: قه‌ناعه‌تت به‌ سه‌ر و شکڵ و ڕۆزییه‌که‌ت هه‌بێ، به‌خته‌وه‌ر ده‌بیت.

**بریسکە: نەخێر، خودام لەگەڵدایە ڕێنوێنیم دەکا**

## زەبەری سێیەم: دادگەی تۆڵەسەندنەوە دامەمەزرێنە با خۆت یەکەم قوربانی نەبیت

ئەو خودایەی بۆ دوێنێ ئێوارێ بەست بوو
بـــــۆ ئەوەی لە سبەش ڕوودەدا بەســـــە

**هەندێ کەس دڵفراوانن و گرنکی بەوە نادەن کە هەموو مافی خۆیان وەربگرن، لە زۆر شتان خۆیان بێئاگا دەکەن و، وای دادەنێن ئەو شتەیان نەدیووە، لە کۆی کاروبارەکان کەسانێکی دڵۆڤان و ئاسانکارن، زۆر بەوردە نیین، بەدوای ئاشکراکردنی دیوی پشتەوەی قسان ناڕۆن، هەر خۆیان بەو شتانەوە ماندوو ناکەن.**

**هەندێ خەڵکی تر هەن هەر نازانن چاوپۆشی چییە، بایی تەنۆلکەیەك لە مافی خۆیان نایەنە خوارێ، هەردەم لەگەڵ خەڵکی لە شەڕ دان تاکو بتوانن بچوکترین افی خۆیان وەدەست بێنن، کە لەوانەیە هەر مافی خۆی نەبێ، ئەوکەسانە بەدەگمەن ڕازی نەبن.**

**بە شێوەیەکی سروشتی مرۆڤی لێبووردە لە ڕەزامەندی و داکەسانی دەروون و خەیاڵ ئاسوودەیی نزیکە و لە دوودڵی دوورە،**

بە هەمان شێوە لە دڵی خەڵکی نزیکە و خەڵکی خۆشیان دەوێ، دەرگەی سەرکەوتن زۆرتر بە ڕووی ئەودا واڵایە لەو کەسەی کە هەموو دەمێ لەگەڵ خەڵکی خودای لە چەقە چەق و شەڕەملانێ دایە، سەرباری ئەوەش ئەم جۆرە کەسانە قسە و بابەتەکان شی دەکەونەوە و، مەبەستێکی پیسی لێ هەڵدەهێنجن، لە هەموو لایەکەوە ڕاڕایی و بەدگومانی بۆ خۆیان ڕادەکێشن، ڕکیان لە خەڵکە و لەبەر زارکی سەرکەوتن دەغەزرن و گاڵەی دەدەن، پێغەمبەرﷺ ئەگەر لەنێوان دوو شتدا سەرپشك کرابایە ئاسانەکەی هەڵدەبژارد، بە مەرجێ تاوان نەبوایە ئەگەر پێغەمبەرﷺ وا نەبوایە دوورترین کەس دەبوو لە خەڵکی.

پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێ: ((رحم الله عبدا سمحا اذا باع، سمحا اذا اشترى، سمحا اذا قضى)) واتە: خودا ڕەحم بەو بەندەیە بکا کە لە کڕین و فرۆشتن و بڕیاردان و دادوەری لێبووردەیە.

درەوشانەوە: ئەوەی ئێستا لە دەستت دێ بیکە بێ ئەوەی دوودڵ بی لەوەی کە دەبێ سبەی چ ڕووبدا.

ناوبڕ: خوداپەرستی بەختەوەرییە و نوێژ سەرکەوتنە.

**بریسکه: قورئانمان نه‌ناردووه‌ته‌ خواره‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی دووچاری ناڕه‌حه‌تی غه‌م و په‌ژاره‌ ببیت.**

## زەبەری چوارەم: نایابی لە کارکردن

ئه‌گه‌ر هاوکاری خودا بۆ که‌سێك نه‌یه‌ت، یه‌که‌مین شت که‌ پیاو ده‌ستی پێوه‌ بگرێ هه‌وڵ و کۆشانی خۆیه‌تی

**یه‌کێ له‌ ده‌وڵه‌مه‌ندان ده‌ڵێ:**

**له‌سۆنگه‌ی ئه‌وه‌ی من ده‌وڵه‌مه‌ندترین پیاوی جیهانم هیچ هه‌ستێکی تایبه‌تییم نه‌بووه‌، له‌گه‌ڵ خێزانه‌که‌مدا له‌ نێو شووقه‌یه‌کی ئاساییدا ده‌ژییم، نه‌ جگه‌ره‌ ده‌کێشم و نه‌ ده‌خۆمه‌وه‌، هیچ حه‌زیشم له‌ شێوازی ژیانی ملیاردێره‌کان نییه‌ که‌ ڕۆژنامه‌کان پڕن له‌ وێنه‌ی وان، ئه‌و ملیاردێرانه‌ به‌له‌می ڕابواردن و کۆشکیان له‌ گوندان هه‌یه‌، ژیانێکی جه‌نجاڵ و پڕ هه‌را و ئاهه‌نگی به‌ ده‌هۆڵ و زوڕنا ده‌گێڕن و کچۆڵه‌ی جوان و دڵگیر له‌پێشیان ده‌ڕه‌قسێن، هاوسه‌رگیری له‌گه‌ڵ ئه‌و کچۆڵانه‌ به‌ ته‌ڵاق کۆتایی دێ و ناچاریش ده‌بن به‌ ملیۆنان دۆلار بده‌ن.**

**ئه‌وپه‌ڕی حه‌زی من ئیش و کاره‌، به‌ ئیشکردنێ دڵخۆشم، زۆرجاران نانی نیوه‌ڕۆ ده‌به‌مه‌ سه‌ر ئیشێ و له‌وێ ده‌یخۆم، هه‌رگیز به‌وه‌ دڵخۆش نابم له‌ دڵی خۆم بڵێم ئه‌وه‌تانێ چه‌ند ملیارم هه‌یه‌، به‌ڵکو ئه‌وه‌ی من دڵخۆش ده‌کا ئه‌وه‌یه‌ کاتێ بیر ده‌که‌مه‌وه‌ که‌ من چۆن کارم بۆ شاره‌**

خۆشه‌ویسته‌که‌م ( تۆکیۆ )کردووه‌ و تۆکیۆم له‌ شارۆکه‌یه‌کی ساده‌ بووه‌ته‌ پایته‌ختێکی وا که‌ چاوی هه‌موو دونیای بکه‌وێته‌ سه‌ر ئه‌ویش به‌هۆی ئه‌و کۆمه‌ڵا نیشته‌جێیه‌ نوێباوانه‌ که‌ توانیم به‌ ئه‌نجامیان بگه‌یێنم، به‌ کورتی و پوختی: دڵخۆشی من له‌ ئیشکردنه‌.

دره‌وشانه‌وه‌: داخ و که‌سه‌ر که‌شتییه‌که‌ت له‌ قوڵایی ده‌ریا ڕزگار ناکا.

ناوبڕ: ئه‌گه‌ر تاوانبارێکت دیت پاشمله‌ی ده‌کرد، پێی بڵێ: له‌ خودای بترسێ.

**بریسکە: ئەرێ خودا بۆ بەندەی خۆی بەس نییە**

## زەبەری پێنجەم: دونیای بێ باوەڕی لە نێو سەرگەردانی ئازار دەچێژێ

ئەگـــــەر جـــــاویدانی بۆ کەسێ گونجابا خۆ
دەبوو
یەکێ نەمر بێت، بەڵام دونیا بۆ هیچ کەس تا سەز
نییە

**دکتۆر (هارۆڵدسین هابین) پزیشك لە نەخۆشخانەی (مایۆ) لێکۆڵینەوەیەکی لە کۆمەڵگەیی پزیشکی ئەمریکی بۆ پزیشکان و نەشتەرگەرانی نێو دامەزراوەی پیشەسازی پێشکەش کرد، کە تێیدا دەڵێ: لە حاڵەتی١٧٦ پیاوم کۆڵیوەتەوە کە هەموان ئیشکەر و کرێکار بوون، تەمەنی هەموویان لە دەوری چل و چوارساڵیدا بوو، بۆم ڕوون بوویەوە زیاتر لە سێ یەکی ئەو کەسانە بە یەکێ لەم سێ نەخۆشیانە دەناڵێنن کە هەر سێ نەخۆشییەکەش بەهۆی ئاڵۆزیی کۆئەندامی دەمار و مێشکە، ئەمانیش: نەخۆشی دڵ، برینی گەدە و فشاری خوێن. تۆ سەیرا ئەم نەخۆشییانە پێش تەمەنی چل و پێنج ساڵی، ئەرێ ئەو کەسە بە سەرکەوتوو ئەژمار دەکرێ، کە تەندروستی خۆی بە ماڵی دونیا فرۆشتووە و تووشی برینی گەدە و نەخۆشی دڵ بووە!؟ ئاخەر چ سوودی هەیە ئەگەر کەسێ هەموو ماڵی دونیاییی هیی ئەو بێ و**

لەشساغ نەبێ. ئەگەر موڵکی دونیا هەمووی هیی یەك کەس بێ خۆ بۆ نووستن تەنیا لەسەر چوارپایەك دەنووێ و لە سێ ژەم پتر ناتوانێ لە یەك ڕۆژدا بخوا، کەوابێ جیاوازی ئەم کەسە و کرێکارێك کە زەوی هەڵدەکۆڵێ چییە؟ لەوانەیە کرێکارەکە خەوێکی قووڵیشی لێ بکەوێ، زیاتریش تام و چێژ لە خواردن بکا، لەو خاوەن کارانەی کە خاوەنی پلە و پای و سەرمایەن.

دکتۆر(ئەلفاریز) W.S.Alfarez دەڵێت: ڕوونبووەتەوە لە هەر پێنج نەخۆشێك چواریان بە هیچ شێوەیەك هیچ بنەمایەکی خانەیی نەخۆشییان نییە، بەڵکو نەساغی وان بەهۆی ترس و دڵەڕاوکێ و ڕك و کینە و خۆپەرستیی و نەتوانینی ئەو کەسەیە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ خۆی و ژیاندا.

درەوشانەوە: ئێمە ناتوانین دەسکاری ڕابردوو بکەین یان داهاتوو بەو شێوەیە بخەملێنین کە خۆمان دەمانەوێ، کەوابێ لە پێناوی چ خۆمان بە داخ و کەسەرێك بکوژین کە ناتوانیین بیگۆڕین!؟

ناوبڕ: ئەو ئافرەتەی خۆی بۆ بێگانان ڕووت دەکاتەوە چ بێ نرخە!

**بریسکە: توڕە مەبە، توڕە مەبە، توڕە مەبە**

## زەبەری شەشەم:
## لە ڕەوشتەکانی هاوژین

بەڵکو ناخۆشییەك، خۆشییەك بەدوای خۆی بێنێ و
ئەو نـــاخۆشییەت بۆ ببێتە خۆشیی و فەرەحنایی

**ئافرەتی بڕوادار و چاك نابێت داواكاری زۆر بخاتە ملی مێردەكەی، بەڵكو وا باشە بە بەشی خودای ڕازی بێ. پێشەنگی ئافرەت لەم بوارە دەبێ خاووخێزانی پێغەمبەرﷺ بێ، عورِوە لە عائیشەی پوری دەگێڕێتەوە، كە دەیگوت: خوشكەزاكەم سوێند بەخودا ئێمە مانگی یەكشەوەمان دەدی، دیسان مانگی یەكشەوەمان دەدی، دیسان مانگی یەكشەوەمان دەدی، سێ پازدە ڕۆژی لە دوو مانگدا، ئاگر لە ماڵەكانی پێغەمبەرداﷺ نەدەكرایەوە، منیش گوتم: ئەی پوریێ ئەی بە چی دەژیان؟ فەرمووی: بە دوو شتە ڕەشەكە: قەسپ و ئاو، ئەوەش هەبوو پێغەمبەرﷺ دراوسێیەكی ئەنساڕی هەبوو، بزنیان هەبوو، ئەو شیرەی بۆ پێغەمبەریانﷺ دەنارد لێیان دەخواردەوە.**

**درەوشانەوە: نرخی ژیان ئەوەیە كە مرۆڤ لە هەموو كاتژمێرێكی بژییێت.**

**ناوبڕ: ئافرەتی بێ ئاین و بێ باوەڕ و ڕووت دڵخۆش نییە.**

**بریسکە: ئیش سوتەمەنی هیوایە و دژی شکستە**

## زەبەری حەوتەم: بەوە ڕازی بە کە خودا بۆی داناوی

گومانی خراپ بە خودای مەبە
خـــودا شـــایەنی گومانی باشە

**ئەو فـــەرمودەی خاتوو هـــاجەرەی (ڕەزای خودای لێ بێ) خێزانی ئیبراهیم و دایکی ئیسماعیل (علیهم السلام) چەند جوانە! دوای ئەوەی ئیبراهیم، هاجەرە و مەلۆتکەکەی لەو دۆڵە وشك و چۆڵە بەجێهێشت و ڕۆیی، هاجەرە لەسەر یەکدی چەند جاران دەیگوت: هۆ ئیبراهیم بۆ کوێ دەڕۆی و لەم دۆڵە چۆڵ و هۆڵە بەتەنێ بەجێمان دێڵی؟ ئیبراهیم دەڕۆی و ئاوڕی دەدایەوە تا هاجەرە فەرمووی: خودا فەرمانی پێکردووی؟ ئیبراهیم فەرمووی: بەڵێ. هاجەرە فەرمووی: کەوا بێ نامانفەوتێنێ. بەڵێ خودا بەند چاکەکانی خۆی نافەوتێنێ. ئەرێ خودا ئەو ژن و پیاوەی سوڕەتی کەهفی باربوو نەکردەوە؟ : [وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَنْ يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا] (الكهف :٨٠)**

**واتە: تازە لاوەکەش (کە کوشتم) ئەوە باوك و دایکی ئیماندار**

بوون، جا ئێمەش ترساین (خۆشەویستی ئەو لاوە) پاڵیان پێوە بنێت بۆ سەرکەشی و بێ باوەڕی.

ئەی خودا گەنجینەی ـ پیاوە چاکەکەی ـ نەپاراست کاتێ داوای لە خدری زیندە کرد دیوارێکی نوێ لەسەر گەنجینەکە بنیات بنێ، تا ئەو کاتەی دوو کوڕەکەی گەورە دەبن و گەنجینەکەی باوکیان دەبەن؟ [وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنْزَهُمَا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا ] (الكهف :٨٢)

واتە: هۆی (چاك کردنەوەی) دیوارەکەش، چونکە هیی دوو منداڵی هەتیو بوو لە شارەکەدا، لەژێریدا گەنجینەیەك هەبوو کە هیی ئەو دوو منداڵە بوو، باوکی ئەو دوو منداڵە چاك و خوداناس بوو، لەبەرئەوە پەروەردگارت ویستی هەردووکیان گەورەو بەهێزببن گەنجینەکەیان دەربێنن، ئەمە ڕەحمەتێك بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە (لەبەر باوکیان) ئەو (شتان) ەی کردم لە خۆمەوە نەبوو ئەوە نهێنی و هۆی ئەو کردەوانەی بوو کە تۆ توانای خۆگرتنت نەبوو لەسەر (کردن)یان.

درەوشانەوە: ناتوانم ڕابردوو بگۆڕم و ئێستاش ناتوانم بزانم چییم بەسەر دێ کەوابێ بۆچی پەشیمان و دوودڵ بم.

ناوبڕ: منداڵەکانت لە کەناڵە خراپەکان بپارێزە

بریسکە: سەرکەوتن لەتەك ئارامگرتنە

## زەبەری هەشتەم: ئاخ و داخ بۆ دونیا مەخۆ

ئای چ سەیرە چۆن سەرپێچی خودا دەکرێ؟
یـــان نکوڵیکار دان بە خـــودا دانـانێ؟

ئەوەی تەمەنی کورتی دونیا و کەموکورتی چێژ و خۆشییەکانی و ڕەوشتە ناحەزەکانی زوو پشتتێکردنی دونیاداران بزانێ هەرگیز ئەفسووس بۆ ئەم دونیایەی ناخوا، ئەو کەسە داخ و کەسەر بۆ ڕابردوو داناکا و غەم بۆ ئەو شتانەی بەسەرچوونە ناخوا، نائومێد نابێ چونکە ئێمە ماڵێکی تر و دونیایەکی تری لەم دونیایە گەورەتر و باشتر و چاکترمان هەیە، ئەویش ڕۆژی دواییە، کەوابێ سوپاسی خودای بکە تۆ بڕوات بە دیداری خودای تاك و تەنیا هەیە. هێ لە تۆ ـ ژنانی بێ باوەڕ ـ بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نییە، خێر و خۆشی لەوەی بڕوای بەو ڕۆژە هەیە و خۆی بۆ ئامادە دەکا، قوڕبەسەری بۆ ئەوەی باوەڕی لاوازە و ئەو ڕۆژە لەبیر دەکا و کۆشك و ماڵ و پارە و سامانە بێ کەڵکەکەی ئەو ڕۆژەی لەبیر بردووەتەوە. ئاخۆ نرخی کۆشك و ماڵ و زێڕ و زیو بێ ئیمان چییە؟ پلەو پایە بەبێ تەقوا نرخی چییە؟ ئاخر ئەگەر پاشا و میر و بازرگانەکان بیانتوانیبا

**بەختەوەری بکڕن ئەو هەموو پاشا و میر و بازرگانەمان نەدەدی وا لەنێو ئەو ژیانە ناخۆش و بێسەروبەرە دەژین و تامی تاڵی غەم و خەفەت دەکەن و هەردەم گازاندە لە گرفت و غەم و خەفەتەکانیان دەکەن.**

**درەوشانەوە: دوێنێ خەونێك بوو ڕۆیی، سبەی هیوایەکی گەشە کەوابێ هەر ئەمڕۆت ڕاست و لەبەردەستە.**

**ناوبڕ: لەبیرت بێ مردوو بە زێڕ و زیوەوە ناخرێتە گۆڕ.**

**بریسکە: ئافرەت مرۆڤە گەورەکانیان پێشکەشی جیهان کردووە**

لە زەمانە گــەڕێ چ دەکا با بیکا، ئەگەریش
چارەنووس پێشهاتێکی هێنا ناخت چاك بکە

**سەیری مرۆڤ و ئەو ناوازەیی و ڕەگەز و جیاوازی زمان و شێوەزاری بکە، خودا بە جوانترین شێوە دروستی کردووە و لە وێنەی بەرزدا کێشاویەتی. [اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ قَرَارًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ ذَلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ] (غافر :٦٤) واتە: خودا زاتێکە کە زەوی بۆ کردوونەتە نیشتەجێ (ئارامگا) و ئاسمانیشی بۆ کردوون بە سەربان و بە جوانترین شێوە ئێوەی دروست کردووە لەوەش حەڵاڵ و پاکە ڕۆزی داوون، ئەمەیە خودای پەروەردگاری ئێوە، بەرزی و پیرۆزی بۆ خودای پەروەردگاری جیهانیان.**

**[يَا أَيُّهَا الإِنْسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ. الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ. فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ]**

**واتە: ئەی ئینسان چی تۆی خەڵەتاندووە بە پەروەردگاری گەورە و بەخشندەت.**

ئەو(پەروەردگار) ەی کە دروستی کردوویت و ڕێکی خستوویت و جیای کردویتەوە لە گیانلەبەرانی تر.

[لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ] (التين :٤)

سوێند بەخودا بەڕاستی ئینسانمان دروست کرد لە جوانترین شێوەدا.

تەماشای ئاسمان و ئەستێرە و خۆر و جوانی ئەوان بکە. سەیری ئەو هەسارە و مانگە پڕشنگدار و ئەو گەردوونە فراوانە بکە، بڕوانە زەوی: [وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا. أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا. وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا]

واتە: لە پاشان زەوی ڕاخست. ئاو و لەوەڕی لێ دەرهێنا و شاخەکانی پتەو دامەزراند.

بڕوانە ئەو دەریا و ڕووبارانە، ئەو شەو و ڕۆژە، ئەو ڕووناکیە ئەو تاریکییە، ئەو هەور و هاوئاوازیی و هاوسەنگییەی لە هەموو بونەوەر هەیە، ئەو سیستەمەو ئەو گوڵ و خونچە و بەروبووم و میوە پێگەیشتووانە، ئەو شیرە بەتام و خۆشە، ئەو هەنگوینە پاڵفتەیە، ئەو دارخورمایە، ئەو مێشەنگوین و مێرووولانە، ئەو کرمۆکانە، ئەو ماسییە، ئەو باڵندە ئاوازخوێنە و ئەو بولبولە گۆرانیبێژە، ئەو خشۆکە، ئەو گیانەوەرە، جوانییەکی نەبڕاوە، جوانییەکی بێ کۆتایی، چاو مۆلەقە لە ئاستی، [فَسُبْحَانَ اللَّهِ حِينَ تُمْسُونَ وَحِينَ تُصْبِحُونَ] (الروم :١٧)

ئینجا پاك و بێگەردی خودا بڵێین کاتێ ئێوارەتان لێ دێت و کاتێ بەیانیتان لێ دێت.

[وَلَهُ الْحَمْدُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَعَشِيًّا وَحِينَ تُظْهِرُونَ] (الروم :١٨]

واتە: سوپاس هەر بۆ خودایە لە ئاسمانەکان و زەویدا و (پاکی و بێگەردی خودا بڵێین) لە شەودا و کاتێ نیوەڕۆتان لێ دێت.

[يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّت وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ] (الروم :١٩)]

واتە: خودا زیندوو لە مردوو دەردێنێ و مردوو لە زیندوو دەردێنێ و زەوی زیندوو دەکاتەوە لەپاش مردن و وشك بوونی و، هەر بەوجۆرە ئێوەش دەردەهێنرێن (لە گۆڕەکان) تان.

درەوشانەوە: لەلایەنە ناخۆشەکانی ژیان مەڕوانە بەڵکو جوانییەکانی بقۆزەوە.

ناوبڕ: ژیانت نوێ بکەوە، شێوازی ژینت هەمەجۆر بکە.

**بریسکە: وقرن فی بیوتکن: لە ماڵێ خۆتان جێگیر بن.**

## زەبەری دەیەم: ئەوپەڕی بەخشندەیی و لوتکەی دەستکراوەیی

چەندە خێر و فەڕ لە دواى نائومێدی هات،
چەند دڵخـۆشی پـاشی بـەدبەختی هات

**ڕۆم هەندێ ئافرەتی موسڵمانی بە کەنیزە برد و هەواڵ گەیشتە مەنسوڕی کوڕی عەمار و پێیان گوت: دەکرێ کۆڕ و دانیشتنێك لە نزیکی میری باوەڕداران ساز کەی و خەڵك بۆ غەزا هان بدەی؟ ڕێك مەنسوڕ دانیشتنێکی لای هاڕونە ڕەشیدی میری باوەڕداران لە ڕەقەی شام ڕێکخست.**

**لەو کاتەی شێخ مەنسووڕ هانی خەڵکی دەدا لە پێناو خودای بجەنگن، بوخچەیەکی نەکراوە و نامەیەك بۆ شێخ هەڵدرا، مەنسووڕ نامەکەی کردەوە و لێی نووسرا بوو: ((من ئافرەتێکی ئەو ماڵە عەرەبانەم، هەواڵی ئەوەم پێگەیشتووە ڕۆم چییان لەو ئافرەتە موسڵمانانە کردووە، گوێبیستی ئەوەش بووم تۆ خەڵکت هان داوە بچنە غەزایێ، لە خۆم ڕوانی لە جەستەی خۆم لە کەزیەکانم خۆشەویستترم نەبوو، بۆیە بڕیم و لەنێو ئەو بوخچەم داناوە، بەناوی خودای سوێندت دەدەم ئەو کەزیانەم بکەنە لغاوی ئەسپێك لەم غەزایە دا، بەڵکو خودای گەورە من لەم حاڵە ببینێ و ڕەحمێکم پێبکا)).**

کاتێ مەنسوورِ خۆی لەبەرانبەر ئەم دەستەواژە جوانانە دی لە پرمەی گریانی دا و خەڵکیش گریان، هارون ڕاست بووەوە و فەرمانی دەرکرد ئاگاداری گشتی(نفیر العام) دەربکرێ، بەخۆشی لەگەڵ شەرکەران غەزای دەکرد هەتا خودا سەریخستن.

درەوشانەوە: بۆ ڕابردوو مەگری، بەخۆڕایی فرمێسکان مەوەرێنە، تۆ ناتوانی ڕابردوو بگێڕیتەوە.

ناوبڕ: لە سروشی لە خوداوە هاتووت باشتر دەوێ؟

یاقووتیان هەڵدەڕژانده سەرپێی کەنیزەکانی زوبێدەی ژنی هارونه ڕەشید، کەچی کەنیزەکان مردن و زوبێدەش مرد، هارونه ڕەشیدیش مرد، بۆ ئێستا چی ماوەتەوە!؟

تەنیا چـاکە و خـێر و ئیشـی باش و نوێـژ و سەڵاوات و کردەوەی چاك ماوەتەوە.

**بریسکە: ئاگادار بن هەر بە یادی خودا دڵەکان ئارام دەبن.**

## یاقووتی یەکەم:
## جێگرەوەی خودای نییە

گورگەکە لوراندی، خووم بە گورگ گرت کە دەلورێنێ،
مرۆڤێك دەنگی هـات، ویستم لەبەری هەڵبێم و بفڕم

**پیاوێك هێ لە کاتی نوێژێ چووە مزگەوتێك، هەرزەکارێکی دە ساڵانی کەوتە بەرچاو، زۆر بەجوانی نوێژی دەکرد، چاوەڕێی کرد تا کوڕە لە نوێژێ بووەوە و چوو سڵاوی لێی کرد و لێی پرسی: تۆ کوڕی کێی؟ کوڕە سەری دانەواند و فرمێسك بەسەر گۆنای شۆڕابەی بەست. دواتر کوڕەسەری بەرز کردەوە و گوتی: مامەگیان من هەتیوم، دایك و باوکم نییە، کابرا کزەی لە جەرگیەوە هات و پێی گوت: بۆ نابییە کوڕێ من؟ کوڕە گوتی: ئەگەر برسییم بێ نانم دەدێیێ؟ کابرا گوتی: بەڵێ. کوڕە گوتی: ئەگەر بێ جلك بم پۆشتەم دەکەی؟ کابرا گوتی: بەڵێ. کوڕە گوتی: ئەگەر نەخۆش بم چاکم دەکەیتەوە؟ کابرا گوتی: ڕۆڵە ئەوەیان ڕێی تێناچێ، کوڕە گوتی: ئەگەر بمرم زیندووم دەکەیەوە؟ کابرا گوتی: ئەوەش ڕێی تێناچێ.**

**کوڕە گوتی: کەوابێ مامەگیان بۆ ئەو خودایەم لێگەڕێ کە دروستی کردووم و ڕێنوێنیم دەکا، خواردن و خواردنەوەم دەداتێ،**

ئەگەر نەخۆش کەوم چاکم دەکاتەوە، هەر بەخۆی لە ڕۆژی دوایی لە تاوانەکانم دەبووریٚ.

کابرا کڕوکپ بوو، وازی لە کوڕەی هێنا و گوتی: بڕوام بە خودا هەیە و ئەوەی پشت بەو خودایەی ببەستیٚ، بەسیەتی.

درەوشانەوە: هەرچەندی قژ بڕنییەوە و لێبگەڕێی غەم و خەفەت دەست لە قوڕگت نێن ناتوانی تۆزقاڵیٚ لە ڕووداوەکانی ڕابردوو بگێڕیتەوە.

ناوبڕ: لەسەر خوێندنەوەی سوڕەتی (تبارك)بەردەوام بە چونکە ڕزگارکەرە.

**بریسکە: ڕەحمەتم هەموو شتێکی گرتووەتەوە.**

## یاقووتی دووەم: بەختەوەری هەیە بەڵام کێ وەیدۆزێ؟

گــــوتمە دڵــــی خـــۆم ئەگــەر خۆت هەڵاوێشت
ئەوا واز لە غەم بێنە، زۆرینەی ترس پووچەو بەلاشە

**مرۆڤ ناتوانێ بەختەوەری هێ لە خودی خۆی بدۆزێتەوە، بەڵام دەبێت بۆ باشترین ڕێباز ڕێنوێنی کرا بێت تاکو پێیبگات، بە کورت و پوختی دەبێت کەسێکی ڕاستگۆ و بوێر بێ و ئیش و کار و خەڵکی خۆشبووێ و، هاوکاری خەڵکی بکات و خۆی لە خۆویستی بەدوور بگرێ، پێش هەموو شتێ ویژدانێکی زیندووی هەبێت، بەختەوەری ئەفسانەیەك نییە بەڵکو ڕاستییەکی ئاشکرایە زۆر کەس تامیان کردووە و ئێمەش دەتوانین تامی بکەین. ئەگەر سوودمان لە ئەزموونی خۆمان وەرگرت و پەندمان لەو ئەزموونە وەرگرت کە لە ژیان وەدەستمان هێناوە، ئەگەر ڕوانینی قوڵمان بۆ ژیان هەبێ دەتوانین لە نێو خودی خۆمان زۆر شت وەدەرخەین. بەهۆی ئەو زانیاری و خواست و ئارامییەی هەمانە دەتوانین لە زۆر نەخۆشی جەستەیی و دەروونی چاکبینەوە، دەتوانیین بەبێ کەللەڕەقی و ئازار و نەگبەتی بژیین.**

درەوشانەوە: هیچ دوژمنێك هێندەی دوودڵی ناتوانێ ئافرەت لە پیری نزیك بکاتەوە و جوانییەکەی لەکەدار بکات.

ناوبڕ: بەهۆی ڕەشبینییەوە خەمۆکی مەهێنە ماڵی خۆت.

**بریسکە: سوێند بەخودا لەمەولا پەروەردگارت ئەوەندەت پێ دەبەخشێ کە ڕازی ببێت**

## یاقووتی سێیەم: ڕەوشت بەرزی بەهەشتێکە لە دڵدا

ئـــــاوات بە هیوا بخـــــوازە و چـــــاوت لێی بێ
وای ژیان بێ بوونی ئومێدێك چەند سەخت و تەنگە!

**خەڵك ئاوێنەی یەکترن، جا ئەگەر یەکێك لەگەڵ ئەوانی دیکە ڕەوشت بەرز بێ بەهەمان شێوە ئەوانیش بەجوانی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، ئیدی سەرودڵی ئەو کەسە دەحەسێتەوە و وا هەست دەکا لە کۆمەڵگەیەکی ڕاست و دروست دەژی.**

**ئەگەر کەسێکیش بێ ڕەوشت و دڵڕەق بێ، خەڵکیش وەکو ئەو دەبن و بەخراپی لەگەڵی دەجوڵێنەوە. ئاخر ئەوەی ڕێزی خەڵکی نەگرێ خەڵکیش ڕێزی لێناگرن.**

**مرۆڤی ڕەشت بەرز لە دڵنیایی نزیکە و لە دوودڵی و ناڕەحەتی و حاڵەتی ناخۆش دوورە، سەرەڕای ئەوەش ڕەوشت بەرزی عیبادەتە و ئیسلام هانمان دەدا بۆی: [خُذِ الْعَفْوَ وَأْمُرْ بِالْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ الْجَاهِلِينَ] (الأعراف :١٩٩)**

**دەست بگرە بە لێبوردەییەوە (چاوپۆشی بکە) فەرمانیش بدە بە چاکە و چاکەکردن و ڕوو وەرگێڕە لە نەفامان و نەزانان، واتە وازیان لێ بێنە.**

خودا وه‌سفی پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌كات و ده‌فه‌رمووێ: [فَبِمَا رَحْمَةٍ مِنَ اللَّهِ لِنْتَ لَهُمْ وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ] (آل‌عمران:١٥٩)

واته‌: به‌هۆی به‌زه‌یی خوداوه‌یه‌ بۆ ئه‌وان نه‌رم و نیانی بووی، ئه‌گه‌ر تۆ قسه‌ ڕه‌ق و دڵ ڕه‌ق بوویتایه‌ ئه‌وه‌ هه‌موو بڵاوه‌یان ده‌كرد له‌ ده‌ورت، كه‌واته‌ لێیان ببوره‌ و داوای لێ بوردنیان بۆ بكه‌ له‌ خودا و ڕاوێژیان پێ بكه‌ له‌ كاروباردا، جا كاتێ(دوا ڕاوێژكردن) بڕیارت دا ئه‌وه‌ پشت به‌ خودا ببه‌سته‌ به‌ڕاستی خوا ئه‌وانه‌ی خۆش ده‌وێت كه‌ پشت به‌خودا ده‌به‌ستن.

پێغه‌مبه‌رﷺ ده‌فه‌رمووێ: ((ان احبكم الي احاسنكم اخلاقا، الموطئون اكنافا، الذين يالفون و يؤلفون، وان ابغضكم الي المشاؤون بالنميمة، المفرقون بين الاحبة، الملتسمون للبراء العيب))

واته‌: خۆشه‌ویستترینتان لای من ئه‌وانه‌ن كه‌ ئاكار جوان و نه‌رم و ساده‌ن، له‌گه‌ڵ خه‌ڵكی ده‌گونجێن و خه‌ڵكیش له‌گه‌ڵ وان دێته‌وه‌، بێزراوترینتان لای من ئه‌وانه‌ن: دووزمانن و دۆستان له‌یه‌ك ده‌كه‌ن و به‌ دوای عه‌یبی كه‌سی بێ تاوان ده‌گه‌ڕین.

دره‌وشانه‌وه‌: دڕدۆنگی و شكست و گه‌ڕان به‌دوای كێشه‌.. هه‌موو ئه‌و شتانه‌ن وا له‌ مرۆڤ ده‌كه‌ن مێشك و هه‌سته‌ ده‌ماری وێران بێ.

ناوبڕ: ئافره‌تی ئازاد له‌ دینداری په‌رییێكی نازداره‌.

**بریسکە: خودا داوای لە هیچ کەسێك نەکردووە مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی.**

## یاقووتی چوارەم: دە بەندی بەختەوەری

ئـــــارامت هەبێ خودا خێر دێنێت
لەوانەیە ئەو بەڵایە نەمێنێت و بڕوا

**زانای دەروونناسی ئەمریکی (د.ڕیکس) دەڵێت: ژیانێکی خۆش و کامەران هونەرێکی جوانە و دە شتی پێویستە کە ئەمانەن:**

**١. ئیش وکارێکی بەدڵی خۆت هەبێ، ئەگەر کارێکی ئەوهات بەدەست نەکەوت، ئەوا حەزو خولیایەی کە هەتە لە کاتی بێ ئیشی و دەست بەتاڵی ئەنجامی بدە.**

**٢. ئاگاداری تەندروستی خۆت بە چونکە ئەمە ڕۆحی بەختەوەرییە.. ئەمەش بە میانەڕەوییە لە خواردن و خواردنەوە و وەرزش و دوورکەوتنەوە لە خووە خراپەکان.**

**٣. بوونی ئامانجێك لە ژیاندا، چونکە ئەم شتە چالاکی و وزەت پێدەبەخشێ.**

**٤. مرۆڤ وەها ژیان وەربگرێ کە بۆی هاتووە، جا بە خۆشی و بە گرفتەوە.**

٥. مرۆڤ لە کاتی ئێستایدا بژیێ، نە داخ و کەسەر بۆ ڕابردووی بخوا و نە مەڕاقیش بۆ داهاتوو بخوا کە هێشتا نەهاتووە.

٦. مرۆڤ لە هەموو کار و بڕیارێك بیر بکاتەوە، لەپای بڕیارەکانی خۆی و لەوەی گیرۆدەی بووە گازاندە لە کەسانی تر نەکا.

٧. لەو کەسانە بڕوانێ کە لە ئەو خراترن.

٨. مرۆڤ خۆی لەسەر زەردەخەنە و ڕۆحسووکی ڕابێنێ و دۆستی کەسانی گەشبین بێ.

٩. مرۆڤ لەپێناو دڵخۆش کردنی کەسانی تر تێبکۆشێ تا بەخۆشی بۆنی بەختەوەری بکا.

١٠. لە دەرفەتە خۆش و شادەکان بەهرەوەر بێ و بە وێستگەی پێویستی بەختەوەرییان دابنێ.

درەوشانەوە: دەست بە ئەمڕۆتەوە بگرە و چێژی لێ وەربگرە، بەدوای ئەو شتانەدا بگەڕێ کە ڕێی ناخۆشیت لێ دەگرن پێش ئەوەی ڕووبدەن و پەلامارت بدەن.

ناوبڕ: مێژوو بخوێنەوە و بیر لە شتە سەیرەکانی بکەوە.

**بریسکە: خودا هەموو ڕۆژێ لە کردنی کارێك دایە.**

## یاقووتی پێنجەم: لە هەموو غەم و خەفەتێك پەنا بە خودا بگرە

ئەگەر ژنان ئەوانە بن کە ئێمە ناسیومانن
دەڵێم: ژن پـــــایەیان لە پیاوان بەرزترە

**بەبیرم نایێ کەسێکی عاقڵم دیبێ کە لە زەردەخەنە ڕژد بێ، یان بڕوادارێك ڕوو لە ڕەشبینی و نائومێدی بکا. دەشێ تورەیی و ناڕەحەتی هەندێ جار دڵنیایی و ڕەزامەندی ببەن بەڵام لە حاڵەتی وا دەبێ کەسەکە پەنا بە خودا بگرێ تاوەکو لەوەی تووشی بووە، خودا ڕزگاری بکا، خۆ دانەدەست خەمۆکی و پەستی سەرەتای ڕووخانی تەواوی ویستە و هەموو ئیش و کارەکانی ئەو کەسە شەپرێو و سەرپچڕ دەبن.**

**بۆیە پێغەمبەرﷺ هاوەڵەکانی خۆی فێردەکرد پەنا بە خودا بگرن تا لەو دەرد و بەڵایانە ڕزگار بن، ئەبو سەعیدی خودری وتوویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەرﷺ چووە مزگەوت و بینی پیاوێکی ئەنساڕی کە پێیان دەگوت ئەبو ئومامە وا لە مزگەوتە، پێغەمبەرﷺ بە بابای ئەنساڕی فەرموو: ئەی ئەبو ئومامە بۆچی دەتبینم لە مزگەوتێ دانیشتووی، خۆ کاتی نوێژێش نییە؟ ئەبو ئومامە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ کەوتوومەتە بن بارێ غەم و قەرزان،**

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: قسەیەکت فێر بکەم ئەگەر بیڵێی غەمت بڕوا و قەرزەکانیشت بدەیەوە، گوتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەوجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەگەر بەیانی و ئێوارەت کردەوە بڵێ: ((اللهم إني أعوذ بك من الهم و الحزن، و اعوذ بك من العجز والكسل، و اعوذ بك من البخل والجبن، و اعوذ بك من غلبة الدين، وقهر الرجال)). رواه ابو داود

واتە: خودایە من پەنا بە تۆ دەگرم لە خەفەت و دڵتەنگی و بێدەسەڵاتی و تەمبەڵی و ترسنۆکی و ڕژدی و لە فشار و زۆری قەرز و قۆڵ و کەوتنە ژێر دەستی خەڵکی. ئەبو ئومامە دەڵێ: وامکرد و خودا غەم و خەفەتی نەهێشتم و قەرزەکانیش دایەوە.

درەوشانەوە: برینی گەدە بەهۆی ئەو شتانەوە نییە کە دەیخۆی بەڵکو بەهۆی ئەو شتەیە کە تۆ دەخوا(غەم).

ناوبڕ: بێبەش کەسێکە لە نوێژی ستۆچەماو(خاشعە) و چاوی بە فرمێسك بێبەشە.

**بریسکە: هەر چاکەو بەهرەیەکتان هەبێ ئەوە لە خوداوەیە.**

## یاقووتی شەشەم: ئەو ئافرەتەی کە پشتوانی لە کات و ساتە سەختەکان بۆ هات

دوو بـــــار (حـــاله) هەن: تەنگـــی و بەڵا
دەستی بە دەستی پێدەکرێ بۆ نیعمەت و خۆشی

**کتێبی (الطبقات) لە فاتیمەی زەهرای (ڕەزای خودای لێ بێ) کچی پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە کە چەند ڕۆژێ بە برسیەتی گوزەراندوویەتی تا پێشەوا عەلی(کم الله وجهه) بینیوویەتی وا فاتیمە ڕەنگی بزڕکاوە و زەرد هەڵگەڕاوە، بۆیە لێی پرسی: فاتیمە ئەوە چیتە؟**

**فاتیمەش گوتویەتی: سێ ڕۆژە هیچمان لەماڵێدا نییە، پێشەوا عەلی فەرموویەتی ئەی بۆچی پێت نەگوتووم؟ فاتیمە فەرمووی: شەوی گوستنەوەم باوکم پێی وتم :(فاتیمە ئەگەر عەلی شتێکی بۆ هێنایەوە بیخۆ ئەگەر نا لێی داوا مەکە).**

**بەداخەوە ئەو ژنانە چەند زۆرن کە ئیش و کاریان تەنیا خاڵی کردنی گیرفانی مێردەکانیانە، هیی وا هەیە ناتوانێ سەیری گیرفانی پڕی پیاوەکەی بکا، باری لەناکاو لە ماڵێ ڕادەگەیێنرێ و دەبێتە هەڵایەك ئەوسەری دیار نەبێ، ژنە ڕاناوەستێ تاوەکو خڕ پارەکەی نەبا.**

بێگومان ئەگەر پیاو جارێك خۆی ڕادەست کرد، هەرگیز ئەم کێشەیە بنەبڕ نابێ و ئەو پارە ساندنە دەبێتە نەریت، ئیدی پاش ماوەیەك لێکترازان و دابڕان دەست پێدەکا، لەوانەشە ئەو لێکترازانە سەر بۆ تەڵاق بکێشێ، ڕۆژێ ئەم دێڕە شیعرانەی کابرای بیاباننشین دەڵێتەوە کە بۆ ئومامەی خێزانی پاش زەحمەتی و ناخۆشییەکی زۆر تەڵاقی داوە و گوتویەتی:

پەلارم لێدەدەن ئومامەم تەڵاق داوە
من لەو کۆت و بەنـــدە ڕزگارم بـوو
خۆزیا دڵی خۆم نەهێشـــــاندبا و
فـــــرمێسکم لە چـــاو نەباراندبا
دەرمانی ئەو شتەی کە حەزت لێ نییە
ئەوەیە: کە لێك دابڕێ و دووربکەویەوە
ژیان لە نێوان دوو کەس خـۆش نییە
کـــــە پێکـــەوە نـــەگونجـــێن

**درەوشانەوە: ژیان بەخۆی کورتە و بایی ئەو ناکا هەوڵی کورتکردنەوەی بدەین.**

**ناوبڕ: گۆڤارە بەدڕەوشتییەکان دڵ تاریك دەکەن چونکە پووچن.**

**بریسکە: سەرکەوتن ئەوەیە ناوت لەسەر دەم و زاری هەموو خەڵکی بێت.**

## یاقووتی حەوتەم: ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشت

ئەو خودایەی بۆ دوێنێ بەست بوو
بـــۆ سـبەش بەســتە و پشتیوانتە

**عەتای کوڕی ئەبی ڕەباح دەگێڕێتەوە و دەڵێت:**
**ئیبن عەبباس پێی گوتم: ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشتت پێ پیشان بدەم؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: ئەم ئافرەتە ڕەشتاڵەیەی هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و پێ یگوت: من فێدارم (گەشکە) جلك و بەرگی بەر خۆم هەڵدەماڵم، بۆیە بۆم لە خودا بپاڕێوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((ان شئت صبرت و لك الجنة، و ان شئت دعوت الله الله تعالى ان يعافيك))**

**ئەگەر دەتەوێ ئارام بگری، بەهەشت بۆ تۆیە. ئەگەریش دەخوازی با بۆت لە خودا بپاڕێمەوە و چاك ببیتەوە، ئافرەتەکە گوتی: ئارام دەگرم بەڵام خۆم هەڵدەماڵم، دوعام بۆ بکە با جەستەی خۆم بەدەر نەخەم، پێغەمبەریشﷺ ئەو دوعایەی بۆ کرد.**

**ئەم ئافرەتە بڕودار و خوداناسە بەم دەرد و بەڵایە ڕازی بوو، کە لەم ژیانە کورتەی دونیا تووشی ببێ لەبەر خاتری بەهەشت،**

به‌ڕاستیش له‌و مامه‌ڵه‌یه‌ قازانجی کرد و بووه‌ ئه‌هلی به‌هه‌شت، به‌ڵام وازی له‌وه‌ نه‌هێنا که‌ خۆی ڕووت بکاته‌وه‌ و خه‌ڵکی شه‌رمگای ببینن، ئه‌مه‌یان له‌ ئافره‌تی موسڵمانی خوداناس ناوه‌شێته‌وه‌، ئه‌ی ده‌بێ چی به‌و ئافره‌ته‌ ڕووت و قووتانه‌ بڵێین که‌ هونه‌رمه‌ندی له‌ خۆ ڕووتکردنه‌وه‌ و ده‌رخستنی جوانییه‌کانیان ده‌نوێنن و ئه‌وپه‌ڕی ڕه‌نج و کۆشش ده‌که‌ن تا خۆیان باشتر ڕووت بکه‌نه‌وه‌.

دره‌وشانه‌وه‌: واز له‌ دڵه‌ڕاوکێ بێنه‌ و ئارام بگره‌ و به‌ پێداگرییه‌وه‌ ڕوو له‌ حه‌قیقه‌ت بکه‌، شتێ بکه‌ تاوه‌کو بژی.

ناوبڕ: چاره‌سه‌ری کێشه‌ی تاوان بریتییه‌ له‌ تۆبه‌، چاره‌ی ئاریشه‌ی دژواریش پاڕانه‌وه‌یه‌.

**بریسکە: یارمەتی بارتاقای سەختی و ناخۆشیی دێ**

## یاقووتی هەشتەم: بەخشین پێش بە بەلا دەگرێ

لەهەموو شتێك لەم گەردوونە نیشایەك هەیە
بـــەڵگەی تـــــاك و تەنیـــــایی خودایە

**بەخشین دەرگایەکی گەورەیە لە دەرگاکانی سینەفراوانی و دڵکرانەوە، ئەگەر کەسێ دەستی لە خێر و چاکە نەگێڕێتەوە خوداش سەرودڵێکی فراوانی دەداتێ و دڵ و دەروونی دەکرێتەوە و بەرچاوی ڕوون دەبی. با کەمیش بێ هەر ببەخشە، هەرگیز بەچاوی کەم و سوکی مەڕوانە بەخشین، جا با دەنکە خورمایەك یان پاروە نانێك یان قومە ئاوێك یا چۆڕە شیرێك بێ، بیدە هەژاران و بە نەدارانی ببەخشە، برسییان تێر کە و سەردانی نەخۆشان بکە، ئەوکاتی دەبینی چۆن خودا غەم و خەفەتت سووك دەکا.**

**بەخشین دەرمانێکە تەنیا لە دەرمانخانەی ئیسلام هەیە.**

**پیاوێك لە پێشەوا عەبدوڵای کوڕی موبارەکی پرسی: ئەی ئەبو عبدوڕەحمان ئەوە حەوت ساڵە برینێك لە ئەژنۆم پەیدا بووە، چومەتە لای چەندان دکتۆر و چەندان دەرمانم بەکارهێناوە، سارێژ نەبووە. ئیبنو موبارەك پێی گوت: بڕۆ و بگەڕێ تا شوێنێك دەبینییەوە**

کە خەڵکی ئەو شوێنە پێویستییان بە ئاو بێ و لەو شوێنە بیرێك لێدە، تکام وایە لەو شوێنەی کە تۆ کارێزێك هەڵدەکەنی، کونی برینەکەت خوێنی لێ بووەستێ، کابرا وایکرد و برینەکەی چاك بووەوە.

ئەی خوشکە بەڕێزەکەم، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی:

((داووا مرضاكم بالصدقة)). واتە: نەخۆشەکانتان بە خێر و بەخشین تیمار بکەن، هەروەها فەرموویەتی: (( ان الصدقة تطفي غضب الرب و تدفع ميتة السوء)) واتە: بەخشین توڕەیی و خەشمی خودای دەکوژێنێتەوە و بەدمەرگی(ميتة السوء) لادەبا.

درەوشانەوە: دڵەڕاوکێ دۆستی بێ ئیشییە.

ناوبڕ: زیکرەکان بەلەمی ڕزگارییین لە دەریای ژیاندا.

**بریسکە: پەری سپیی چاو ڕەشن، لەنێو خێوەت و چادرەکاندا دەرناچن.**

## یاقووتی نۆیەم: با ڕۆحت جوان بێ چونکە بوونەوەر جوانە

لەبەر کارەساتی دوێنێ شـپرزە مـەبە
چونکە ڕووداوی دونیایێ تا سەر نییە

**بێگومان دیمەنی ئەستێرەی ئاسمانێ جوانە، جوانییێکە هەر بە دڵ هەستی پێدەکرێ، جوانییێکە بە ڕەنگ و کاتی جیاواز خۆی نوێ دەکاتەوە، لە بەیانی تا ئێوارە دە ڕەنگان دەگۆڕێ، لە ڕۆژهەڵات بۆ ڕۆژاوا و لە شەوێکی پڕشنگدار بۆ شەوی تاریك و نوتەك، لە سامالّی بۆ لێڵی و هەورینی، تەنانەت لە کاتژمێرێك بۆ کاتژمێرێکی تر، لە ڕووانگەیەکەوە بۆ یەکێکی تر، لە گۆشەیەك بۆ گۆشەیەکی تر دەگۆڕێ و هەمووشی هەر جوانە و سەرجەمیشیان بە ژیری و عەقڵ وەردەگیرێ.**

**ئەم ئەستێرە ناوازە پڕشنگان داوێ، هەر دەڵێی چاوێکی جوانە و بە عیشقەوە هەڵدێ، ئەها ئەو جووتە ئەستێرە لێرەن، خۆیان لە ئاوەدانی بەدوور گرتووە و بە گوێی یەکتری دەچرپێنن!..**

**بڕوانە ئەو گەلە ئەستێرە لێرە و لەوێ دەڵێی کۆڕی یارانە لە ئاهەنگی ئاسمان، شەوی وا هەیە مانگ ڕووناکە و تریفان داوێ، بڕێ**

جار پڕشنگان داوێ و، هەندێ جار لێڵە، جاری واشە دەڵێی کۆرپەیەکی تازەبووە. هەندێ جار چاوشارکێ دەکا و خۆی دەشارێتەوە..!

ئەم گەردوونە بەرفراوانە، هەرگیز چاو لە سەیرکردنی تێر نابێ و ناتوانێ ئەوپەڕی ببینێ.

ئەوەیە جوانی، جوانییەك مرۆڤ دەتوانی لێی ڕامێنێ و بیری لێبکاتەوە، لێ هەرگیز ناتوانێ بە وشە و پەیڤی خۆی وەسفی بکا.

درەوشانەوە: پێویستە ئەو باردۆخەی پێش هاتووە، قەبوڵی بکەی، جا ئەگەر دوودڵ بی چ سوودی هەیە؟

ناوبڕ: تەنیا لەمڕۆت بژی، دوێنێ ڕۆیی و نایێتەوە، سبەش هێشتا نەهاتووە.

**بریسکە: نابێ ئێوە وەکو ژنانی سەردەمی نەزانی جوانیی خۆتان دەربخەن.**

## یاقووتی دەیەم: ئافرەتێك پاڵەوانییەتی تۆمار دەکا

دڕکێك بە لاسکی گوڵێکەوە دەبینی و چاوت
لە ئاست بینینی شەونمی سەر گوڵەکە کوێرە

**میری باوەڕداران عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ)، هەستا حەبیبی کوڕی موسلیمەی فیهری ڕاسپارد ببێتە سەرلەشکری موسڵمانان بۆ تەمبێکردنی ڕۆم، چونکە ڕۆم گێچەڵ و بێ ڕێزییان بەرانبەر موسڵمانان دەکرد، هاوسەری حەبیب سەربازێکی نێو سوپایەکە بوو، پێش ئەوەی شەڕ دەست پێبکا، حەبیب بەناو لەشکرەکەدا دەگەڕا تا گەیشتە خێزانەکەی خۆی و لێی پرسی: ژنێ ئەگەر شەڕ گەرم بوو لە کوێ چاوم پێت بکەوێتەوە؟ ژنە باوەگۆی داوە: یان لە چادری سەرکردەی ڕۆم یان لە بەهەشتێ دەمبینیتەوە! ئاگری شەڕ دایسا، حەبیب و سوپایەکەی شەڕێکی نەبەردانەی وایان کرد نموونەی نەبێت و هەرگیز شەڕی وا نەکراوە، خودا بەسەر ڕۆمدا سەریخستن، حەبیب پەلە پەلی دەکرد بگاتە خێوەتی سەرکردەی ڕۆم تا لەوێ چاوەڕوانی هاوسەرەکەی بکا، کە گەیشتە زارکی**

چادرێ، شتێکی سەیری دی، بینی هاوژینەکەی پێشی ئەو کەوتووە و چووەتە نێو چادری گەورەی ڕۆم!

ئەگەر ژن وەکو ئەم ژنەی بن، دڵنیام پایەی ژنان لە هیی پیاوان بەرزترە

دەرەوشانەوە: مادام تۆ لە ژیاندا بتوانی بجوڵێی و ئیش بکەی هیچ شتێ سەخت و ئەستەم نییە.

ناوبڕ: بەدوای ناڕەحەتی ئافرەتی بڕوداری بێئاگا مەگەڕێ.

مێژوونوسان دەگێڕنەوە شەغەبی دایکی خەلیفە قاهیر یەك کۆگەی پڕ لە گەوهەری هەبوو، پاش ئەوەی کوڕەکەی لە خەلیفایەتی لادرا، چاوی خەلیفەیان دەرهێنا و ئەو گەوهەرانەیان لە دایکی ستاند و جلك و بەرگیان لەبەر داکەند، کۆت و بەند کرا و گەلێکیان بە قامچیان لێدا، ئەوەی یەك تۆز ڕەحمی لەدڵدا بووبێ بۆی دەگریا، بۆیە تکات لێ دەکەم تۆ گەوهەری وا بۆخۆت ببە دەستی کەسی نەگاتێ، ستەمکار نەتوانن بیبەن، ببێتە ئەمانەت لای خودا، ئەوجا هەر لە نوێژی سپی و چاوی تەڕ و خێر و بێر و قورئانخوێندن.

**بریسکە: یادم بکەن یادتان دەکەم.**

## گەوهەری یەکەم: کات و ساتی خۆت لە هیچ و خۆڕایی بەسەرمەبە

هەر کە پارە و ماڵمان زۆر بوو غەم و خەفەتیشمان
لەگەڵی زۆر بوو، خەفـــەت لە زۆری و بۆری دایە

**پێغەمبەرەکەت ﷺ دەفەرموویێتە عائیشە: ((وان کنت المت بذنب فاستغفري الله و توبي الیه، فان العبد اذا اعترف بذنبه و تاب تاب الله علیه..)) واتە: ئەگەر تووشی گوناهێك بووی تۆبە و ئیستیغفار بکە و بگەڕێوە چونکە ئەگەر بەندە دانی بە تاوانەکەی نا و، گەڕایەوە، خودا دەیبەخشێ.**

**وا دابنێ تۆ هەموو ئەو شتانەت هەیە کە خواست و خەونی تۆن، بە هەموو هێڤی و داخوازی خۆت گەیشتووی کە دڵت دەیەوێ، دواتر هەر لەناکاو هەموو شتەکانت بێکەڵك بوون و نەمان، ئەو کات دەگری و ئازار دەچێژی و ئاخان هەڵدەکێشی و پەنجەی خۆت بۆ ئەم شتانە دەگەزی کەوا لەدەستت چوون، ئەی چی دەربارەی تەمەنت دەڵێی کەوا بێ هودە دەڕوا و تۆ هەر هەستیشی پێ ناکەی؟**

**تەمەنی تۆ گەوهەرێکی گرانبەهایە بە هیچ شتێکی ماددی ناخەملێندرێت، ڕاستییەکەی ئەو تەمەنە چەند هەناسەیەکە هەر هەناسەیەك بدەی ئیدی گەڕانەوەی نییە، ئەو هەناسانە سەرمایەی**

تۆن، لەم دونیایە دەتوانیت ئەو خەڵات و ناز و نیعمەتانەی پێ بکڕی کە لە بەهەشت دەتەوێ، چۆن ئەو تەمەنە بەبێ تۆبەیەکی نەسوح تێدەپەڕێنی؟

درەوشانەوە: یەك تاکە ڕێ هەیە ئێمە بەرەو شادبوون دەبا ئەویش وازهێنانە لە ترسان لە شتانێك کە لە توانای ئێمەدا نییە بەرزەفتیان بکەین.

ناوبڕ: دەستت بۆ دوعایان هەڵبڕە با پڕ خێر و بێر بێ.

**بریسکە: هەر خودات بەسە**

## گەوهەری دووەم: بەختەوەری بە پارە ناکڕدرێ

خووی نەفس ئاوایە بەدڵی بکەی ویستی زیـاد دەبێ
ئەگەریش بە کەمە ڕازی بکەی فێری قەناعەت دەبێ

**زۆرن ئەوانەی تەمەنی گەنجی و لەشساغی خۆیان لە پێناو کۆکردنەوەی ماڵ و سامان بەختکرد، پاشان هەموو ئەو پارەی کۆیان کردبووەوە لەو تەمەنەی مابوویان، سەرف کرد تا بەختەوەری بەدەست بێنن کەچی تاڵی و بەدبەختییان وەگیرکەوت، ئەوان خەریك بوون لاویی بگێڕنەوە کەچی پیری دەستی لێستاندن، ئەوان چوون لەشساغی بەدەست بێنن کەچی لەولاوە نەخۆشی بێ دەرمان یەخەی گرتن.**

**ئەکتەرێکی بەناوبانگ دەڵێت: تاکە ویستی ژیانم بریتی بوو لە پارە و ماڵ. ئەم ئەکتەرە وەهای بیردەکردەوە بەهۆی ئەو ماڵ و سامانەی دکارێ ببێتە بەختەوەرترین. کەسی سەدە! بڕوای وا بوو دەتوانێ لە سۆنگەی ئەو ماڵ و موڵکەوە هەموو خواست و ئارەزووەکانی بکاتە ڕاستی و دونیا لەنێو دەستی ببێتە پەرداخە ئاوێك، دوای بیست ساڵ خودا زۆر زیاتر لەو ماڵەی دایێ کە**

دەیویست، لێ تەندروستی و گەنجی و خەونەکانی لێ ستاندەوە، لێی دەگێڕنەوە لە جێیان چۆن دەگریا و دەیگوت: خۆزگە داوای ماڵ و سامانم لە خودا نەکردبا، بریا داوای ژیانێکی سەد ساڵەم بەهەژاری لێ کردبا و هەر پاقڵەی کوڵاوم خواردبا، ئەم ئەکتەرە بەهای لەشساغی نەدەزانی تاکو لەدەستی نەدا، کاتێك بووە دەوڵەندترین هونەرمەندی میسر بۆی ڕوون بووەوە ماڵ و سامان دەستەوەستانن لەوەی بتوانن هەموو شتیان پێ بێ، دەرکی بەوە کرد بەو هەموو پول وپارەی ناتوانێ تاکە ڕۆژێك چییە بیخاتە سەر تەمەنی لەدەستچووی.

درەوشانەوە: پێویست ناکا ئافرەت نیوەی تەمەنی خۆی لە ڕك و ڕکابەری زایە بکات.

ناوبڕ: نەکەی گاڵتە بە ئاین بکەی چونکە ئەوە بابەتی: باوەڕ و کوفرە!

**بریسکە: پەنا بەرنە بە نوێژ و ئارامگرتن**

## گەوهەری سێیەم: پەلەپەل و زوو هەڵچوون سوتەمەنی سەختی و ناخۆشیین

ئەگـــەر خــــۆزگە بێتە دی
ئەوا خۆشترین ژیانمان دەبێـت

**نەرم و نیانی جۆرێکی سوارچاکی باڵایە، مرۆڤ بەهۆیەوە دەتوانێ تورەبوون و نەزانی و هەوەسی بەرزەفت بکا. لەسەرەخۆیی، بریتیە لە خۆڕاگری و پەلەنەکردن و جولانەوە بەعەقڵ و لێزانی، ئەو دوو ئەدگارە شەڕن دژی دڵەڕاوکێ. ئەوەی یەکێکیان لەدەست بدا خێرێکی زۆری لەدەستداوە، کەسی نەرم و نیان بەهێوری خۆی بەرپەرچی زۆرێك لەشەڕ و فیتنە دەداتەوە، بەڵام نەزانی تورە شەڕ و فیتنە گەورەدەکا و مێشێك دەکاتە گامێشێك و دڵەڕاوکێ پتر دەکا. مرۆڤی خۆگر کەمجار حەسرەتکێشە، یاخود کەم هەڵدەکەوێ دەست بە شتێك بکا و بەرئەنجامی نادیار بێ، وەلێ کەسی گێل و بزۆز هەموو تەمەنی بەداوای لێبوردن و ڕاڕایی و بەدبەختی دەباتە سەرێ. بەم شێوەیە ئەو مرۆڤەی کە لەگەڵ خۆی و خەڵکی نەرمە سەرکەوتووە، سەر و مێشکی هێدییە و خەیاڵی تەختە. ئاینی ئیسلام پێداگری لەسەر**

نەرم و نیانی و ئاسانکاری دەکا. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: (( ان الرفق لا يكون في شئ الا زانه و ينزع من شئ الا شانه)) واتە: نەرم و نیانی لە هەر شتێك بێت جوانی دەکا، لە هەر شتێکیشدا نەبێ بێزەوەری دەکا.

درەوشانەوە: بەڕاستی ئێمە لەم ژیانەدا کات و ساتی بەختەوەری خۆمان لەپێناو شتی پڕوپوچ بەفیڕۆ دەدەین.

ناوبڕ: خاتوو زبێدە کارێزێکی لە مەککە هەڵکەند، چاوی حەسوودان نەدەچووە خەوێ!

**بریسکە: لە ئایندا هیچ کارو کردەوەیەکی قورسی لەسەر دانەناون.**

## گەوهەری چوارەم: یاری کۆکردنەوەی پارە کۆتایی نایێ

هەموو دونیا بۆ خۆتان ببەن هێ لەو دڵەی من
بـا دڵی من سەربەســـت و ڕەند و بێ ماڵ بێ

**بیڤر برۆك دەڵێت: پارە و پولێکی زۆر زۆرم کۆکردەوە، لێ لە ئەزموونی واقیعیدا بینیم درێژەدان بەو یارییە، یاری کۆکردنەوەی ماڵ مەترسیدارە و پایانی نییە و تەمەن و بەختەوەریم هەڵدەلوشێ، بۆیە کارەکەم گۆڕی و ڕووم کردە ئیشێکی تر کە خۆم حەزم لێی دەکرد، کاری بڵاوکردنەوە و پەخش بوو، هەرچەند پارەی زۆریشم لێ بەدەست نەدەکەوت، بەڵام خۆشبەختی و خزمەتی کۆمەڵگەم بەدەست هێنا، بۆیە ئامۆژگاری هەموو کەسێکی خاوەن ئیش و کار دەکەم هەر هێندە پارە کۆبکەنەوە کە بەشییان دەکات و واز لە یاری ماڵ کۆکردنەوە بێنن. پێش کاتی یاسایی خۆم خانەنشین کرد تاوەکو تام و چێژ لەو شتانە وەربگرم کە پەیدام کردوون و دەستم بە کارێکی دڵخوازی خۆم کرد کە لە خزمەتی کۆمەڵگە بوو، لە ڕووی کاتیشەوە بەکەڵك بوو.**

**ئەو کەسانەی پارە و پولێکی زۆر کۆدەکانەوە و هێندە گوێ بەوە نادەن ئەو ماڵ و موڵکە هەمووی دەبێتە میرات، چونکە وا**

دەزانن ئەوان پایەبەرزترن لەوانەی کە لە مەیدانەکەن و تەنیا عەقڵ و ڕەوشتیان هەیە. ئەو پارە و سامانەی بێ ڕەنج و ئارەقە هاتووەتە دەست دەبێتە توڕەیی و نەفرین و بەدبەختی، نابێتە نیعمەت و بەختەوەری، جەستەی ئەم جۆرە پیاوانە لە خۆشی و ڕابواردن تێر دەبێ بەڵام عەقڵ و دڵیان بەتاڵ و بۆشە و گوڵی ڕۆژانی گەنجییان دەژاکێ.

درەوشانەوە: بیروباوەڕی خۆت پتەو بکە بەجۆرێ هیچ جۆرە ئەستەمێك لە ژیانتدا نەبێ.

ناوبڕ: تا بگەیتە پایەی دۆستایەتی با هەموو خۆشەویستت بۆ خودا و پێغەمبەر ﷺ بێ.

**بریسکە: ئەی ئاگر ساردبەرەوە و بۆ ئیبراهیم بێ زیان بە**

## گەوهەری پێنجەم: لە بێکاریدا هەر ناخۆشی دێتە بەر

هەمـوو ئەو شتانەی مرۆڤ دەیخوازێ بۆی نایێتە دی، لەوانەیە با بەجۆرێك هەڵکا بە ئارەزووی کەشتی نەبێ

**لە هەناوی بێ ئیش و کاریدا هەزاران خراپە و بەدڕەفتاری دێتە بەر و میکرۆبی مەرگ و بێسەروبەری سەردەردێنێ. ئەگەر ئیش و سەرقاڵی پەیامی زیندووان بێت، ئەوا بێ ئیش و کارەکان مردوو حیسابن. ئەگەر ئەو دونیایەی ئێمە مەزرای ژیانێکی مەزنتر بێ کە لە داهاتوو دێ ئەوا کەسانی دەست و پێ سپی شایەنترین کەسن کە بێ مایە حەشربکرێن چونکە هێ لە ماڵکاولی و پەشیمانی چ بەروبوومی دیکەیان نییە.**

**پێغەمبەرﷺ ئاگایی داوە، هەزاران کەس بێئاگان لە نیعمەتی لەشساغی و کات، هەروەکو دەفەرمووێ: ((نعمتان مغبون فيها كثير من الناس: الصحة، والفراغ)). واتە: دوو بەخشش هەن کە زۆرینەی خەڵکی لێی بێئاگان ئەوانیش: لەشساغی و کاتی بەتاڵە.**

**بەڵێ چەندان کەسی ساغ و سەلامەت ئەم ژیانە بێ هیچ هیوا و ئامانجێك تێدەپەڕێنێت، بێ ئەوەی ئیشێك بکەن یان پەیامێکی**

تایبەت بەخۆیان هەبێ و تەمەنی خۆیان لە سەرخستنی ئەو شتانە ببەنە سەرێ، خەڵکی بۆ ئەوە دروستکراون ؟ نەخێر، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرمووێ: [أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ. فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ] ( المؤمنون:١١٦)

واتە: ئایا ئێوە گومانتان وابووە کە بێگومان ئێوەمان بەبێ هوودە دروست کردووە و بێگومان ئێوە ناگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە. جا بەرز و بڵندی بۆ خودای پاشای ڕاست و ڕەوا، هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لەو کە پەروەردگاری عەرشی بەڕێز و بەرزە.

خودا ژیان و زەوی و ئاسمان و ئەوەی لە نێوانیانە بە ڕاستی دروست کردووە، مرۆڤ دەبێ ئەو ڕاستییە بناسێ و پێی بژیێ.

بەڵام ئەگەر کەسێك خۆی خستە نێو قاوغی حەز و ئارەزووە بەرتەنگەکانی و خۆی چاو بەست کرد، بێ لەزەتترین ئێستا و داهاتووی بۆ خۆی هەڵبژاردووە.

درەوشانەوە: هـــەردەم وێنەی ســـەرکەوتن لە ئەندێشـــەی خۆت بنەخشێنە.

ناوبڕ: ماڵێ خۆت وڵاتی تۆیە بە باوەڕ ئاوەدانی بکەوە.

**بریسکە: لە لایەکەوە ڕزق و ڕۆزی دەدات کە بە خەیاڵدا نەهاتووە.**

## گەوهەری شەشەم: ماڵێکی بێ تورەیی و هەرا و هۆریا و شەکەتی

گەنجی ژیر و هۆشمەند ئەگەر ئارامیشی نەمێنێ
خـــــــۆ دەبێ خـــــۆڕاگر و چـــــەسپاو بێ

**کچە بە گریان و نوزە نوزەوە دەیگوتە باوکی: هۆ باوەگیان دوێنێ شتێ لە نێوان من و هاوژینەکەم ڕوویدا، ئەویش بەهۆی قسەیەك بوو کە من کردم، بینییم تورە بووە خەجاڵەت بووم لەوەی کردم و داوای لێبووردنم لێی کرد، کەچی ئەو لەگەڵی تێکدام و ڕووی لێ وەرگێڕام، هەر لە دەوری هەڵسوڕام هەتا بە پێکەنینم هێنا و ئاشتم کردەوە، دەترسێم نەوەك خودا لەسەر ئەم چەند چرکەیە بمگرێ کە ئەو پیاوەم وەها دەهری کرد و خوێنی دەکوڵا! باوکی بە کچەی گوت: ڕۆڵەی شیرینم سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر پێش ئەوەی هاوسەرەکەت لە خۆت ڕازی بکەی و مردبای گەردەنم ئازا نەدەکردی، ئەی نازانی ئەگەر هەر ئافرەتێك هاوسەرەکەی لێ دڵزویر بێ، لە تەوڕات و ئینجیل و زەبوور و قورئان نەفرینلێکراوە، سەرەمەرگ بۆ ئەو سەخت دەبێ و گۆڕی بۆ تەنگ دەبێ. ئەی خۆشی و بەختەوەری بۆ ئەو ئافرەتەی کە پیاوەکەی لێی ڕازییە.**

**ئافرەتی چاك ئەوپەڕی هەوڵی ئەوە دەدا لای پیاوەکەی ئازیز و لەبەر دڵ بێ، هەرگیز شتێکی وا ناکات ژیان لە خۆی و پیاوەکەی تاڵ بکا، پیاوێك ئاوا ئامۆژگاری خۆی و خێزانەکەی دەکرد:**

| | |
|---|---|
| خذي العفو مني تستديمي مودتـي | ولا تنطقي فـي سورتـي حين اغضب |
| ولا تنقريني نقرك الـــدف مـــرة | فـــانـك لا تـدرين كيف المغيب |
| ولا تكثري الشكوى فتذهب بالهوى | و يـــاباك قلبي و القلـــوب تقلب |
| فاني رايت الحب في القلب و الاذى | اذا اجتمعا لة يلبث الحـب يذهب |

**واتە:**

**لەگەڵم لێبوردە بە هەمیشە سۆز و بەزەیی منت دەبێ**

**ئەگەر من توڕە بووم تۆ مەدوێ**

**ڕەخنەم لێ مەگرە و دەهۆڵم لەدو مەکوتە**

**تۆ نازانی چۆن لەبەرچاوم دەکەوی**

**زۆر گازاندان مەکە و بە هەوەسی خۆت مەڕۆ**

**پشت لە دڵم مەکە چونکە دڵ دەگۆڕێ**

**پێم وایە ئەگەر خۆشەویستی و ئازار لە دڵێکدا جەم بوون،**

**هەر دەبێ خۆشەویستی بڕوا چونکە ئەو جێی نابێ.**

**درەوشانەوە: وێنەی شکست فڕێ دە و لە دەرەوەی هۆش و بیرت داینێ.**

**ناوبڕ: تۆ بەو باوەڕەی خۆت لە گەوهەر جوانتری، چونکە ئەوەی لاتە ئەوپەڕی جوانییە.**

**بریسکە: ئەوەی باوەڕی نەبێ تەناهی(امان) نییە**

## گەوهەری حەوتەم: داوێنپاکی و شەرم جوانی ئافرەت زیاد دەکات

که دڵم ڕەق دەبێ و ڕێ و ڕێبازگەلم لێ تەنگ دەبن
خـــۆم دەسپێرمە چـــــاوپۆشیی و لێبوردەیی تـــۆ

**هەواڵی ئوم سەلەمەی (ڕەزای خودای لێ بێ) خێزانی پێغەمبەرتﷺ پێ نەگەیشتووە لە کاتێکدا گوێی لە پێغەمبەرﷺ بوو کە دەیفەرموو: ئەو کەسەی سەبارەت بە شانازی کردن و پۆزەوە کراس هەڵبکا لە ڕۆژی دوایی خودا سەیری ناکا، پرسیم: ئافرەت چ کاریان بە شۆڕکردنی جلك و بەرگ هەیە؟ فەرمووی: بستێك کراس درێژ دەکەن هەتا هەڵیبکەن، گوتم: کەوابێ قاچ و قولیان دەردەکەوێ، فەرمووی: گەزێك کراس شۆڕ دەکەن و پتری ناکەن.**

**ئوم سەلەمە چ دایکێکی چاك بووا .. ئەی خودا لێت ڕازی بێ خاتوون چتۆ ئافرەت بووی! لە ژنانی خۆبەزلزان و قەپۆزبڵند نەبووی، بەڵکو ئافرەتی موسڵمان بە شەرم و پاك و خاوێن و ڕێزدارن چ پێویست ناکا قاچ و قولیان ببیندرێ، دەبێ کراسیان بای ئەوەندە درێژ بێ لە دوایان بخشێ تا هیچ پیاوێك نەتوانێ سەیریان بکا،**

بەڵام ژنانی ئەم سەردەمە ــ هێ لەوانەی خودا ڕەحمی پێکردوون ــ تا دەتوانن کراس هەڵدەکەن گوایە لەبەر تەڕبوون و پیس بوونە خۆ ئەگەر لە دەستییان بێ هەر دایدەکەنن و هیچ لەبەر ناکەن، چاو لە ئافرەتانی ڕووت و قووتی بێباوەڕان دەکا، سەد بڕوبیانوو بۆ ئەم ڕووت و قووتییە دێننەوە لا حول ولا قوە الا باللە، پیاوەکانیشیان خۆ هیچ پیاوەتییان لە دڵی نییە و هەر بە ناو پیاون، شان بە شان لەگەڵیان دەڕۆن، هەر گوێشییان نادەنێ، بەڕاستی شەرم باری کرد.

سوێند بەخودا ژیان و دونیا خێر و خۆشی تێدا نامێنێ ئەگەر شەرم نەما.

درەوشانەوە: تەندروستی لە کەمخۆرییە دەروونتدروستی لە کەم تاوانییە.. ڕاحەتی دڵ لەوەیە هێندەی گوێ بە دونیایێ نەدەی.. سەلامەتی زمانیش لە کەم قسەکردنە.

ناوبڕ: لەنێو دڵی بێ دەسەڵاتان درەختی خۆشەویستی خۆت بچێنە.

بریسکە: خودا باشترین کاروبار دەزانێ

## گەوهەری هەشتەم:
## خودا نادیاران دەگێڕێتەوە

خودایە! یەکەم شت کە دڵ و هزرم پێیان گوتم:
بــــە پەنهانـــــــی و بە ئاشـــــکرا یادت بکەم

**دوای لێکدابڕانی زیاتر لە بیست ساڵ، خودا وای دانا بوو ــ لە چیرۆکێکی تەواو سەرنجڕاکێش ــ دایك و کچێکی تەمەن بیست و پێنج ساڵە بەیەکتری شاد ببنەوە. دوای ئەوەی بارودۆخی ژیان لێکی دابڕی بوون، ئەو دیتنەوە لە کاتی بەسەربردنی مانگی هەنگوینی لە ناوچە گەشتیارییەکانی چیای سەودە لە ئەبها ڕوویدا.**

**دایکەکە دوای ئەوەی لە مێردی یەکەمی جیا بووەوە کچێکی سێ ساڵانەی لای مێردی یەکەمی بەجێهێشت و، مێردی کردەوە و مێردی دووەمی بەبەردەوامی وڵاتە و وڵات دەگەڕا، بۆیە دایکەکە نەیدەپرژایە سەر بینینی کچەکەی کە لای باوکی بوو.**

**لە ڕۆژێك لە ڕۆژە جوانەکانی وەرزی هاوین لە چیای سەودە لە ئەبها لە یەکێك لە هاوینەهەوارەکان کچە چاوی بە خانمێك کەوت و هەردووکیان کەوتنە قسە و سەربوردان، ئەوان یەکدیان**

نەدەناسی چونکە دایکەکە ئەم کچەی خۆی لە تەمەنی سێ ساڵان بەجێهێشت بوو، لەوکاتی ئەوان سەرگەرمی قسان بوون دایکە بینی پەنجەیەکی کچەکەی قرتاوە، ئیدی کەوتە پرسیاران و لەبارەی دایکی کچەکەی پرسی، کچەش هەموو بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕایەوە، ئیدی دایکە زانی ئەمە کچەکەی خۆیەتی کە ئەوە بیست ساڵە نەیدیووە، یەکسەر لە باوەشی گرت و بە هەموو سۆز و خۆشەویستی خۆی ماچی کرد و ئەو هەموو شەوق و سك سووتانەی خۆی بۆ باسکرد کە ئەو هەموو ساڵە لە دووری ئەم کچە چێشتوویەتی.

درەوشانەوە: بیرکردنەوە لە بەختەوەری ناچارت دەکا بیر لەو شتانە بکەیتەوە کە پێش بەختەوەری دێنە ڕێت یان دوای بەختەوەری تووشت دەبن، ئەم شتە لە خودی خۆی بەختەوەریت لێ تێکدەدا.

ناوبڕ: خوێندنەوەی پیتێك لە قورئان دە چاکەیە.. ئەفسوس بۆ بێئاگایان!!

**بریسکە: هەر دەڵێی یاقووت و مەرجانن**

## گەوهەری نۆیەم: پەیڤێك هەموو کات و شوێنێك پڕ دەکا

ئەی ئەو خودایەی گازاندەت لە لا دەکرێ و هانات بۆ دێنن
تـــۆ ئامادەی بۆ هەموو ئەو شتانەی لێت چاوەڕێ دەکرێ

**موسا - سەلامی خودای لەسەر بێ - فەرمووی: خودایە، نزایەکم فێر بکە تاوەکو پێی داوا لە تۆ بکەم و موناجاتت لەگەڵ بکەم، خودا فەرمووی: ئەی موسا، بڵێ: (لا اله الا الله)، موسا فەرمووی: هەموو خەڵکی دەڵێن: (لا اله الا الله)، خودا فەرمووی: ئەی موسا، ئەگەر هەر حەوت چینی ئاسمان و زەوی لە تای تەرازووێکدا بێ و (لا اله الا الله) لە تایەکەی تر بێ (لا اله الا الله) گرانترە.**

**لا اله الا الله.. تیشکگەلی بە شۆقی هەیە، ئەم ڕستە بە گوێرەی تینی بریسکە و تیشکەکانی، هەموو تاریکی و تەمتومانێکی تاوان دەڕەوێنێتەوە، نوورێکی هەیە، نووری ئەهلی ئەم زیکرە جیاوازن ـ هەندێك نوورەکەیان بەتینە و هەندێکیش کز و لاوازە.**

**هەندێك خەڵك هەن نووری ئەم زیکرە لە نێو دڵیان وەکو خۆرە و نووری هەندێکی تریان وەکو بریسکەی ئەستێرەیە، نووری نێو**

دڵی هەندێکیش وەکو مەشخەڵێکی گەورەیە، هەندێکی تر وەکو چرایەکی ڕووناکە، هەندێکی تر وەکو کزە چرایەکە.

تاوەکو نووری ئەم پەیڤە بەهێز و بەتاو بێ دەتوانێ گومان و حەز و شەهوەت بسوتێنێ.

**درەوشانەوە:** خۆشەویستی خودا بەختەوەری بڕوادارە، خۆشەویستی لەپێناو خودا بەختەوەرییەکە لە هەموو شتێ قوڵترە، هەر ئەم بڕوادارە ڕاستگۆیانە پێی دەزانن و دەیچێژن و هیچ شتێکی تر لەبری ئەو خۆشەویستییە وەرناگرن.

**ناوبڕ:** تەنیا گرنگی بەو شتە بدە ئیشی تۆیە نەك بەوەی پێوەندی بە تۆوە نییە.

**بریسکە: ئافرەتان لە گەنجینە گرانترن و لە سامان بەنرخترن**

## گەوهەری دەیەم:
## دڵانێك تامەزرۆی بەهەشتن

پێش مـــــردنێ لە ژیـــــان بــــەختەوەر بە،
گوڵی خۆت هەڵپاچە، تا بای خەزانێ نەهاتووە

**خۆ چیرۆکی ژنەکەی ساڵحی کوڕی حوییت بیستووە، ئەو ئافرەتە دوای مردنی پیاوەکەی دوو کوڕی هەبوو. کاتێ کوڕەکان گەورە بوون و جاحێڵ بوون، یەکەم شت ئەم ئافرەتە کە فێری کردن خوداپەرستی و شەو هەستان بوو بۆ عیبادەت.**

**دایکە بە کوڕەکانی گوت: نابێت خولەکێك لە شەودا بەسەر ماڵی ئێمەدا تێبپەڕێ و یەکێك نەبێ بە ئاگا بێ و یادی خودای بکا، کوڕەکان گوتییان: دایەگیان جا ئێمە چی بکەین فەرمان بکە، دایکە گوتی: شەو لە نێوان خۆمان دەکەینە سێ بەش، یەکێکتان لە بەشی یەکەم هەڵبستێ و ئەوەی دی لە بەشی دووەمین و منیش لە سێیەکی کۆتایی هەڵدەستم و ئێوەش بۆ نوێژی بەیانی بانگ دەکەم، کوڕ گوتیان: بە چاوان دایە گیان، دوای ئەوەی دایکە وەفاتی کرد، کوڕەکان شەوبێداریان وازنەهێنا چونکە حەزی خوداناسی و بەندایەتی دڵی پڕ کردبوون، خۆشترین کاتی ژیانیان ئەو کاتە بوو**

کە شەویێ هەڵدەستان، ئەو جارە شەویان کردبووە دوو بەش، هەر بەشەو یەکێکیان هەڵدەستان، کاتێك یەکێکیان نەخۆش دەکەوت ئەوەی دیکە بەتەنیا شەوەکەی زیندوو دەکردەوە .

درەوشانەوە: ژیان بەو ڕووە جوان و گەشەی وا لە دەوروبەرمانە بریتییە لە بانگەشەیەکی ڕاست بۆ بەختەوەری.

ناوبڕ: پێش جامی ماڵی خەڵکی جامی ماڵی خۆتان چاك بکە!

ئەی ئەو کەسەی پێداگری لەسەر ئەوەی ئەنگوستیلەگەت جوان بێ تا ئەگەر لە پەنجەت کرد جوان دەربکەوێ، ئەرێ ئەم قامك و ئەنگوستیلە دەمێنن! چەندان پەنجە کە جوانترین ئەنگوستیلەی جیهانیان لە پەنجە کرابوو نەمان، داوێنپاکی یاخود ڕاستی و شکۆی ئیمانی و کردەوەی باش و پاك بپۆشە، تا ببیتە جوانترین کچی ئەم جیهانە.

بریسکە: ئەگەر بێنە سەر ئەژماری بەخششەکانی خودا، لە ژماردن دادەمێنین.

## ئەنگوستیلەی یەکەم: بڕواهێنان بە خێر و شەڕی چارەنووس

گەنجی قەناعەت چ ترسی لەسەر نییە و
پێویستی بە ئێشکچی و پاســەوان نییە

خودای گەورە دەفەرمووێ: [مَا أَصَابَ مِنْ مُصِيبَةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي أَنْفُسِكُمْ إِلَّا فِي كِتَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ نَبْرَأَهَا إِنَّ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ. لِكَيْلَا تَأْسَوْا عَلَى مَا فَاتَكُمْ وَلَا تَفْرَحُوا بِمَا آتَاكُمْ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ] (الحديد: ٢٣)

واتە: هیچ زیان و بەڵایەك ڕووی نەداوە نە لەزەوی و نە لەخودی خۆتاندا ئیللا لە (لوح المحفوض) دا نووسراوە پێش ئەوەی بەدی بهێنین بێگومان ئەوە بۆ خودا زۆر ئاسانە. تا خەفەت نەخۆن بۆ ئەوەی لە دەستتان چووە و دڵخۆش و غەڕا نەبن بەوەی کە پێی داوون و خودا هیچ خۆ بەزلزانێکی شانازیکەری خۆش ناوێت.

هەروەتر دەفەرموێ: [كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَعَسَى أَنْ تُحِبُّوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌّ لَكُمْ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ] (البقرة: ٢١٦)

واتە: جەنگتان لەسەر پێویست کرا کە لاتان ناخۆشە و دەگونجێ شتێکتان پێ ناخۆش بێت و باش بێ بۆتان و دەگونجێ شتێکتان پێ خۆش بێت و خراپ بێ بۆتان و خودا (چاك و خراپی ئێوە) دەزانێ و ئێوە نایزانن.

بڕوابوون بە قەزاوقەدەر ڕۆڵێکی باشی هەیە بۆ دڵدانەوە لەکاتی کارەسات و بەڵادا، بەتایبەتی ئەگەر بەندە بەتەواوی پەی بەوە ببا کە خودا میهرەبانە و دەیەوێ کارئاسانی بکا، هەر بەخۆی لێزان و چازانە، لە دواڕۆژدا پاداشتی ئارامگران بەبێ ئەژمار دەداتەوە. ئەوە لە کاتی گەشبینی و کارکردن بەو شتە هەرچی غەم و خەفەت و دەرد و بەڵایە دەبێتە خۆشی و بەختەوەری، لێ کوا هەموو کەس ئەم توانایەی هەیە؟

ئەو هەنگاوانەی لەسەرمان پێوستە جێبەجێیان بکەین بۆ بارسوککردنی غەم و بەڵا لەسەر دڵ و دەروون، کامانەن؟

١- وادابنێ ئەگەر بەڵایەکە لەوەی گەورەتر بوو هەروەها داهاتووێکی خراتری لەمە هەبوو.

٢- بڕوانە حاڵی ئەو کەسانەی کە کارەساتی گەورەتر و سەختتریان بەسەرهاتووە.

٣- سەیری ئەو هەموو ناز و نیعمەتەی بکە کە تۆ تێیدای و زۆرانیش لێی بێبەشن.

٤- لە کاتی گرفت و بەڵا خۆت ڕادەستی ڕووخان مەکە [فَإِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا إِنَّ مَعَ الْعُسْرِ يُسْرًا] (الشرح :٦)

واتە: بەڕاستی لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت. بێگومان لە ڕاستی دا لەگەڵ هەموو تەنگانەیەکدا خۆشی و ئاسانی دێت.

**درەوشانەوە:** زەردەخەنەیەکی ڕاستیی کە لەنێو دڵەوە بێت، خێراترین پەیامی بەختەوەرییە بۆ نێو دڵ و دەروونی ئەوانی دی.

**ناوبڕ:** ئەوەی پاشملەی کردی بیبەخشە چونکە ئەو خێر و چاکەی خۆی کردووەتە دیاری بۆ تۆ.

**بریسکە: جگە لە خودا کەس نییە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی ئاشکرا بکات.**

## ئەنگوستیلەی دووەم:
## باشترین کار میانەییە

هەموو ڕەوشێك داهاتووێکی هەیە و لەوانەیە
ئـــەوەی پێت نـــــاخۆشە بۆ تۆ چاك بێ

**موستەفا مەحمود دەڵێیت: من هەست بە بەختەوەری دەکەم چونکە خۆم پیاوێکی ناوەندگیرم و ویست و تەندروستی و بژێویشم ناوەندییە.. لە هەموو شتێ کەمێکم هەیە.. ئەمەش واتە پاڵنەری زۆرم هەیە، ژیان پاڵنەری منە..**

**پاڵنەر لە ژیانی ئێمەدا، واتە ئەو گەرم و گوڕییەی کە لە ژیانی ئێمەدا هەیە، بریتییە لەو مایەی کە دەتوانین ژیانی خۆمانی پێ هەڵسەنگێنین.**

**بۆ خوێنەری ئەو دێڕانە لە خودای دەپاڕێمەوە کە ژیانێکی ناوەندییان بداتێ و لە هەموو شتێك، شتێکی کەمیان بداتێ.. بە ناوێ خودای ئەم دوعایە زۆر باشە!**

**دایکم لە قسەی گەورە و بەتوێکڵ تێناگا، بەڵام خاوەنی هەستێکی پاك و سروشتێکی خاوێنە، بێ خوێندنەوە لەم وتەیە**

تێگەیشت و ناوێکی سادەی لەم وتەیە نا: پاراستن.. پاراستن، واتە لە هەموو شتێ تۆزێك و لە ڕۆحدا زۆر و زەوەند.

درەوشانەوە: زەردەخەنەی درۆینە وێنەیەکی ڕووت و قووتە لە وێنەکانی دووڕوویی.

ناوبڕ: جوانکاری و ئاریشتەکانت دەفەوتێن و چاکەکانت دەمێننەوە.

**بریسکە: بیلبیلەی چاوم نوێژە**

## ئەنگوستیلەی سێیەم: ڕەشبینی غەم و خەفەتان لە خۆی کۆدەکاتەوە

دەکرێ شتێ لە کۆتاییەکەی بەرەو باشیی بچێ
لە دوای ئـــــەوەی بە ناخۆشی دەستی پێکرد

**برادەر کاریگەری لەسەر هەست و نەست و ڕەوشتی برادەرەکەی هەیە، ئەگەر برادەرەکە ـ جا چ هاوڕێ یان هاوژین یا هاونشین یان دۆست ـ کەسێکی نەرم و هێور، ڕووخۆش، دڵکراوە و گەشبین بێ لە ژیان، ئەم سیفەتە باشانە بۆ برادەرەکەشی دەگوازێتەوە.**

**بەڵام ئەگەر برادەرەکە بابایەکی ڕەزاگرانی، ترش و تاڵ و، مڕوموچ و، دوودڵ و ڕەشبین بێ، ئەو دڵەڕاوکێ و دانەکەسانە بۆ برادەرەکەی دەگوازێتەوە. خۆ برادەرایەتی بەس لە برادەرایەتی مرۆڤ کورت نابێتەوە ئەوەتانێ کتێب و بەرنامەی تەلەفیزیۆنی و کەناڵەکانیش دەگرێتەوە، لەوانیشدا گەشبینی و ڕەشبینی هەیە، هەیانە دڵەڕاوکێ دروست دەکا و هەیانە دڵارامی وەبەردێنێ، بەتایبەت کتێب وەکو وەرزەکان وایە، بەهار و پایزی هەیە، جا ئەگەر کەسەکە زیرەك بوو لە هەڵبژاردنی کتێبی باش و گەشبینانە بۆ ژیان و وای لێ دەکردی کۆشان و سەرکەوتن و بڕوابەخۆبوون بەدەست بێنی، ئەوا خوێنەر**

دەرگای خۆشی و بەختیاری بەرەو ژیانی خۆی ئاوالاّ دەکات و سروەی خۆشی بۆ هەڵدەکا، خودانەخواستە ئەگەر کەسێك کتێبی گوماناوی و ڕاڕایی و ڕەشبینانە بەرانبەر ژیان و خەڵك هەڵبژێرێ، ئەم جۆرە کتێبانە بەرانگژی بابای خوێنەر دەکەن وەکو چۆن میکرۆب مرۆڤ گەڕ و گول دەکا ئەوها ژیانی لێ تاڵ دەکەن.

درەوشانەوە: ڕێگەی بەختەوەریت لەپێشە لە زانست و کردەوەی چاك و ڕەوشتی بەرز بەدەستی بێنە و لە هەموو کاروبارێکت میانەڕەو و دڵنیا بە.

ناوبڕ: زەرەر ئەوەیە فەرزەکانت بچێ و تووشی گوناهان بیت.

**بریسکە: خودا ئارامی و ئاسوودەیی بۆ ناردن**

## ئەنگوستیلەی چوارەم: ئامانە وریای سەرزەنشت و بێزاری و خەشم بە

ئەوەی لە هەڵزنان بەسەر هەوراز و هەڵدێری شاخان
بترسێ
هەتا هەتایە دەبێ لەنێو نزمەلان و گـــەلییان
بیگوزەرێنێ

**یەکێك دەڵێت: کاتێك لە تەمەنی بیست سی ساڵییدا بووم، سەرەڕای خۆشی ژیانم زۆر بە گلەیی و گازاندە و پرتە و بۆڵە بووم، ئەویش لە سۆنگەی نەزانییم بوو بە بەختەوەری، نەمدەزانی هەر بەڕاستی من وا لەنێو جەرگەی بەختەوەرییم، ئێستا تەمەنم لە شێست ساڵی تێپەڕییوە، چاك دەزانم، بەڕاستی من لە تەمەنی بیست سی ساڵی بەختەوەر بووم، بەڵام داخەکەم دوای چ؟ لە دوای ئەوەی تەمەن ڕۆیی ئەوجا زانییم، ئێستاش بەس یادگارییەکانم ماون، چ یادگارییەك؟ پڕ سوێ و پەشیمانی، ئەگەر کاتی خۆی پێم دەزانی، دەبوا زۆر بەخۆشی بژایابام و تامم لە ژیانم کردبا، من لە هەرەتی لاوی هیچ هۆیەکم نەبوو تا هێندە بێزار و بەگلەیی بم. بەدرەنگەوە، ئێستا گوڵی بەختەوەری دەبینم، ئێستاش من و ئەو پووت و ژاکاوین، لەگەڵ تۆمە خوێنەری ئازیز با پێت بڵێم یان بە خۆشی و هەموو هەستەکانتەوە بەختەوەر بژی، هەستی**

بۆن و بینین و هەموو هەستەکانی ترت بەو گوڵە پشکوتووانەی بەردەستت تێر بۆن بکە، یان ئەو شتانە لە بیر کە و بۆ خۆت لە لایەکی دی بڕوانە، ئەوکات دەبیتە نێچیری سەرزەنشت و گازاندان، لەوێ ئێستاکەت لێ دەبێتە ڕابردوو، پاشان فرمێسکت کاروان کاروان بۆ ئێستا لە چاو دێتەخوارێ، ئەو کات دەبینی تۆ چەندە بەختەوەر بووی و نەتدەزانی، لێ کاتەکە ڕۆییوە و کاتی زانین نییە، ئەوەی لەبەردەستت دەمێنێتەوە تەنیا چەند یادگارییەکی ناخۆش و سیسە.

درەوشانەوە: ئافرەت دەتوانێ ماڵێ خۆی بکاتە بەهەشتێ بەرین و لە دەستیشی دێ بیکاتە جەهەندەمی بەرگەنەگیراو.

ناوبڕ: ئەگەر لەگەڵ ئافرەتان دانیشتی خودای عەرد و عاسمانانیان بە بیر بێنەوە.

**بریسکە: خودا لەوان ڕازی بوو، ئەوانیش لە خودای ڕازی بوون.**

## ئەنگوستیلەی پێنجەم: زۆربەی کێشەکان بەهۆی شتی هیچ و بێ مانایە

ئەرێ تۆ نازانی من هەر کاتێ دەچم سەردانی بکەم
بۆنێکی خـــــۆش دەکەم با عەتریش لە ماڵی نەبێ

**زۆر بەداخەوە زۆرجاران شتی بچووك و بێنرخ دەبێتە هۆی ئەوەی هەزاران کەس سەلیقە لەدەست بدەن و ماڵ و حاڵییان لێ تێکچێ و، پێوەندی برادەرایەتییان نەمێنێ، لەو دونیایەیدا بە شێواوی و پەشیمانی بمێننەوە. (دیل کارینگی) ئەنجامی ئەم هەڵچوونانە باس دەکات کە بەهۆی شتی کەم ڕوودەدات، دەڵێت: ((شتی پڕوپوچ لە ژیانی هاوسەرییدا وا لە ژنەکە و پیاوەکە دەکات عەقڵیان ڕاوەستێ و نیوەی ئازاری دڵ لەم دونیایەی بەهۆی شتی کەم و هیچەوەیە)).**

**تەنانەت پێتۆل و شارەزاکانیش ئەمەیان پشتڕاست کردووەتەوە، (جۆزێف ساباتی) دادوەر لە دادگەی شیکاگۆ دوای داوەریکردنی زیاتر لە چل هەزار حاڵەتی جیابوونەوە(الطلاق) دەڵێت: هەمیشە شتی پڕوپوچ هۆکاری تێکچوونی شیرازەی هاوسەرگیرییە.**

(فرانك هۆگەن) جێگری داواکاری گشتی نییۆرك دەڵێت: نیوەی ئەو حاڵەتانەی دەدرێتە دادگەی کەتن بەهۆی کێشەی بچووك و هیچەوەیە، وەکو دەمەقاڵێی نێوان تاکەکانی خێزان یان قسەیەکی ڕەق یان گاڵتەیەك یان ئاماژەیەکی ڕووشێنەر.

ئەم شتە بچووك و کەمانە سەردەکێشن بۆ کوشتن و تاوان.

کەمێك لە ئێمە هەر بە سروشت کەسانی دڵڕەقن، ئەو تانە و تەشەرانەی لە خودی ئێمە و کەرامەت و خۆ بەزلزانی ئێمە دەدرێ هۆکاری نیوەی ئەو کێشانەیە کە ئێستا دونیا بەدەستییەوە دەتلێتەوە.

درەوشانەوە: خێر و چاکە گەورەترین نیعمەتن کە پێویستە چاوێرییان بکەین، بگرە ئەگەر دەروون پڕ چاکە بوو ئیدی ئەو کەسە شادمان و بەختیارە.

ناوبڕ: بیر لە تۆڵە مەکەوە، چونکە هەردەم دەبییتە قوربانی.

**بریسکە: هانا دەبەنە بەر خودا، ئەویش دێت بە هانایانەوە.**

## ئەنگوستیلەی شەشەم:
## هونەری پاراستنی زمان

ئـەگەر دووچاری نەخۆشی وئازارێك بووم ئــەوا
لەنێو ئەو ناڕەحەتییەدا دەبمە بەردێکی کەڕوکپ

**مێژوونووسان دەگێڕنەوە: خـــالیدی کـــوڕی یەزیدی کوڕی مەعاویە غەیبەتی عەبدوڵای کوڕی زوبێری دەکرد کە دوژمنی بنەماڵەی ئومەیە بوو، دەیگوت: عەبدوڵا کەسێکی ڕژدە. خێزانی خالید ناوی ڕەملە بوو، دەیکردە خوشکی عەبدوڵا، لەوێ دانیشتبوو، متەقی لێیەوە نەهات و یەك وشەی نەگوت. خالید پێی گوت: ئەوە بۆ چ ناڵێی دەڵێی قسەکەمت پێ خۆش بوو یان هەر ناتەوێ وەڵامم بدەیەوە؟ ڕەملە گوتی: نەخێر، هیچییان ڕاست نیین، چونکە ئافرەت بۆ ئەوە دروست نەکراوە خۆ هەڵبقورتێنێتە نێو کاروباری پیاوان، ئێمە چەپکە گوڵی بۆن و باوەشیین، چ کارمان بە نێوانی ئێوەیە؟! خالید سەری سوڕما ، نێوچەوانی ڕەملەی ماچ کرد.**

**پێغەمبەرﷺ زۆر بەتوندی قەدەغەی کردووە هاوسەران نهێنی نێوان خۆیان بدرکێنن.**

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە ئەسمای کچی یەزید دەگێڕێتەوە: کە ئەو لە خزمەت پێغەمبەرﷺ بوو، ژن و پیاویش لە خزمەتی دانیشتبوون. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((لەوانەیە پیاو هەبێ باسی ئەوەی بکا چ لەگەڵ خێزانی خۆی دەکا، لەوانەیە ژنیش هەبێ باسی ئەوەی بکا چ لەگەڵ پیاوەکەی دەکا)). خەڵکەکە هەموی کڕوکپ بوون هیچییان نەگوت، منیش گوتم: ئەرێ وەڵا ئەی پێغەمبەری خواﷺ ژنانیش وا دەکەن، پیاوانیش وا دەکەن. خۆشەویست ﷺ فەرمووی: ((وا مەکەن، ئەم شتە وەکو ئەوەیە لەسەر ڕێگەیەکدا شەیتانێکی نێر بگاتە شەیتانێکی مێیە، جووت بن و خەڵکیش تەماشایان بکات!))

خودای گەورە دەفرمووێ:[ الرِّجَالُ قَوَّامُونَ عَلَى النِّسَاءِ بِمَا فَضَّلَ اللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ وَبِمَا أَنْفَقُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ فَالصَّالِحَاتُ قَانِتَاتٌ حَافِظَاتٌ لِلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ اللَّهُ وَاللَّاتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَاهْجُرُوهُنَّ فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا (النساء :٣٤)

واتە: پیاوان سەرپەرشتیارن بەسەر ئافرەتانەوە بەهۆی ئەوەوە خودا باوی هەندێکیانی داوە بەسەر هەندێکیاندا هەروەها بەهۆی ئەوەی کە (پیاوان) لە سامانەکانیان خەرج دەکەن، جا ئافرەتە چاکەکان (ئەوانەن) گوێڕایەڵانی بەردەوام (بۆ خوداو پاشان مێردەکانیان) پارێزەرانی (داوێنی خۆیان و سامانی مێردەکانیانن) کە مێردەکانیان لە ماڵەوە نەبن بەهۆی ئەوەی خودا فەرمانی

پاراستنی داوە). هەندێ لە ڕاڤەکارن ئەم ئایەتە وا تەفسیر دەکەن:

مەبەست لە (خۆپارێزان) ئەوانەن: نهێنی سەرجێی نێوان خۆیان و پیاوەکانییان دەپارێزن، هەر پێویستیشە بەتەواوی ئەم ڕازە بشاردرێتەوە.

درەوشانەوە: لەبری ئەوەی ناخۆشی و کێشەکانت بژمێری نیعمەتەکانی خودای بژمێرە.

ناوبڕ: (استغفرالله) بکە هەتا شەیتانی وا لێ بکەی خۆی بکوژێ.

**بریسکە: ژیان کورتە بۆیە بە غەم و خەفەتان کورتتری مەکەوە.**

## ئەنگوستیلەی حەوتەم: بە نوێژ شەو لەگەڵ دڵەڕاوکێ بکە

تـــــاوانم زۆرە، بەڵام کە لەگەڵ لێبوردەیی تۆ
بەراوردم کرد بینییم لێبوردەیی تۆ زۆر گەورترە

**ئافرەتانی موسڵمانی پێشیین دەیانزانی نوێژ پەتی پێوەندی نێوان خودا و بەندەیە، هەر بەندە ملکەچەکان براوەن: [قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ. الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ] (المؤمنون:٢)**

**واتە: بەڕاستی باوەڕداران ڕزگار دەبن، واتە سەردەکەون ئەو کەسانەی کە لە نوێژەکانیاندا لەخوداترسن (گەردن کەچن) بۆ خودا.. ئافرەتانی پێشین شەوان هەڵدەستان و بەوپەڕی ملکەچییەوە خوداپەرستیان دەکرد، دەیانزانی ئەم کارەیان باشترین توێشووی قیامەتە، هاوکاری گەیاندنی بانگەواز بریتییە لە نوێژ، ئەو نوێژە وا لە نوێژکەر دەکات لەبەرانبەر سەختی و ئاڵۆزییەکانی خەڵك بەهێز و پتەو بێ، شەوبێداری لە هەرە کردەوە باشەکانە بۆ نزیك بوونەوە لە خودا هەروەکو خودای گەورە دەفەرموێتە یەکەم بانگخوازی خۆی: [وَمِنَ اللَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِ نَافِلَةً لَكَ عَسَى أَنْ يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَحْمُودًا] (الإسراء :٧٩)**

واتە: (ئەی پێغەمبەرﷺ لەبەشێکی شەودا هەستە، شەو نوێژ بکە بە قورئان خوێندن تێیدا، ئەوە زیادە نوێژی تایبەت بە تۆیە، ئومێدەوار بە پەروەردگارت بتگەیەنێتە پلەو جێگایەکی پەسەند کراو. پەسەنی ئەوانە دەدا کە شەوبێدرای دەکەن: [كَانُوا قَلِيلاً مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ] (الذاريات :١٧) واتە: ئەوانە کەمێك لە شەودا دەخەوتن واتە شەو نوێژیان دەکرد.

ئەنەس دەگێڕێتەوە: پێغەمبەرﷺ هاتە مزگەوت و بینی پەتێك بە ئەستوونێکی مزگەوت بەستراوەتەوە. پێغەمبەرﷺپرسی: ئەم پەتە چییە؟ گوتیان: ئەم پەتە هی زەینەبە ئەگەر شەکەت بوو خۆی پێدەبەستێتەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((حلوه، ليصل احدكم نشاطه، فاذا فتر فليقعد)). لێی بکەنەوە با هەر کەسێ لە ئێوە چەندی پێکرا نوێژێ بکا کە هیلاك بوو با دانیشێ. ئافرەتانی بڕودار ئا بەم جۆرە زۆریان لەخۆ دەکرد و لەپێناو بەدەست هێنانی ڕەزامەندی خودا خۆیان شەتەك دەدا، تا پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێکردن لە توانای خۆیان زیاتر نەکەن، باشترین خوداپەرستی ئەوەیە: کەم و بەردەوام بێ، خۆ ئاشکراشە ژنانی ئەم سەردەمە هەموو کات و ساتی شەووڕۆژیان پڕە لە ئیشی دونیا. لەوەی کەمتر چییە ئەگەر دوو ڕکات نوێژان لە تاریکی شەوێ بکەن تا بتوانن بەسەر شەیتاندا زاڵ بن، باشترین کاروبار ناوەندگیرییە، پێغەمبەرﷺ سێ جاران فەرمووی: (دەککە زۆربلێ و زێدەڕۆ لەناوچن).

دڕەوشانەوە: ئەگەر ڕاستگۆی متمانەت بە خودا بێ، ئەگەر تۆبە کاریشی بە بەیانییت دڵخۆش بە.

ناوبڕ: هەزار قەسیدەیان بەسەر خاتوو شەجەرتودەڕیدا هەڵگوت، خاتوون مرد و شیعرەکانیشی لەگەر خۆی برد.

**بریسکە: ئارامگرتن کلیلی خۆشییە**

## ئەنگوستیلەی هەشتەم: چەند ئامۆژگاریەکی ئافرەتێکی سەرکەوتوو

خودایە گیان سوپاس بۆ تۆ هێ لە تۆ سوپاســی ناکرێ
ئەی ئەو خودایەی هەموو بونەوەر ئومێد و نیازی پێتە

**دایکێکی ئـەم ســەردەمەی خۆمـــان ئەم ئامۆژگارییانەی کچـەکەی خــۆی تێکەڵ بە خەندە و فرمێســـك کردووە. دایکە گوتویەتی: کچی شیرینم تۆ بەرەو ژیانێکی نوێ دەچی، ژیانێك کە دایك و باوکت یا براکانت شوێنییان تێیدا نییە، تۆ دەبیتە هاوسەری پیاوێك کە تەنیا و تەنیا تۆی دەوێ، ڕازی نابێ کەسێك هاوبەشت بێ تەنانەت ئەو کەسەی لە خوێن و گۆشتی تۆش بێت.**

**ببە خێزانی و ببە دایکیشی، وای لێ بکە هەست بکا تۆ هەموو ژیان و هەموو دونیای ئەوی، هەردەم لەبیرت بێ پیاو ــ جا هەر پیاوێك بێ ــ منداڵێکی گەورەیە، بچوکتریت وشە دڵخۆشی دەکا، وای لێ مەکە بەو هاوسەرگیرییەی لەگەڵ تۆی کردووە وا هەست بکا تۆی لە ماڵ و خزمانت دابڕیوە، ئەویش هەمان هەستی هەیە، ئەویش بەهەمان شێوە ماڵی باوك و خێزانی خۆی لەپێناو تۆدا بەجێهێشتووە، لێ جیاوازی لەنێوان تۆ و ئەودا وەکو جیاوازی نێوان**

ژن و پیاوە، ئافرەت پتر سۆز و غەریبی بۆ ئەو ماڵ و خێزانە هەیە کە لێی لەدایکبووە و گەورە بووە و فێربووە، بەڵام پێویستە ئافرەت لەسەر ئەو ژیانە تازەی ڕابێ، پێویستە لەگەڵ ئەو هاوژینەکەی هەڵبکا و خۆی بگونجێنێ، ئەم پیاوە مێرد و سەرپەرشت و باوکی منداڵەکانییەتی.. ڕۆڵە ئەمەیە دونیایە نوێیەکەت.

کچی شیرینم ئا ئەمە ئێستا و داهاتووتە، ئەمەیە ئەو خێزانەی تۆ و پیاوەکەت دروستتان کردووە. کچە ئازیزەکەم من ناڵێم دایك و باوك و خوشك و برای خۆت لەبیر کە چونکە ئەوان هەرگیز لەبیرت ناکەن، جا دایك چۆن جەرگی خۆی لەبیر دەکا؟ لەهەمان کات شوەکەی خۆت خۆشبوێ و بۆ ئەو بژی و بە هاوژینی ئەو خۆشحاڵ بە.

دەرەوشانەوە: لە ئاسیا وانەی ئارامگری و لە خەدیجە وەفا و لە عائیشە، ڕاستبێژی و لە فاتیمە خۆڕاگری فێربە.

ناوبڕ: بەشێك لە خێر و خۆشیی خۆت بدە برسی و هەژاران.

**بریسکە: پێش ئەوان لە ئادەمی و جنۆکە، دەستی کەسیان پێ نە کەوتووە.**

## ئەنگوستیلەی نۆیەم: ئەوەی بە خـــودای دڵخـــۆش نـــەبێ بە هیچ شتێ دڵخۆش نابێ

ئـــــەمڕۆ و ڕۆژی تریش هەیە
ئیشی خودای چاوەڕێ دەکرێ

**خودا هاودەمی باوەڕدارە، سێبوری گوێڕایەڵانە و خۆشەویستی خوداناسانە ئەوەی خدوو بە خودا بگرێ ئەوا حەزی لە ژیانە و کەیفی بەو بوونەی دێ و چێژ لە ڕۆژگاری ژیانی وەردەگرێ، دڵارام و سینەفراوان دەبێت، خۆشەویستی خودا لەنێو دڵی نەخش دەبەستێ، سیفەتەکانی خودای لە ویژدان و دەروونی جێگیر دەبێت، ناوەکانی خودا دێنە بەرچاوی، ئەو ناوانە لەبەر دەکا و لە سیفەتەکان ڕادەمێنێ، هەردەم ئەم ناوانە لەنێو دڵی ئامادەییان هەیە، ناوەکانی بەخشندە (الرحمن)، دلۆڤان (الرحیم)، نەرم و نیان (الحمید)، چاکە (البر)، بەسۆز و بەزەیی (اللطیف)، چاکەکار (المحسن)، خۆشەویست (الودود)، بەڕیز (الکریم)، مەزن و هێژا(العظیم)....، هاودەمی لەگەڵ خودا و خۆشەویستی و نزیکی لە خودا کاری تێ دەکەن.**

هەستی نزیکی خودا لە بەندەکانی شادمانی لێ دێتە بەر، بەندە بەو چاودێرییەی خودا کەیفخۆش دەبێت: [وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ] (البقرة :١٨٦)

واتە: هەردەمێ بەندەکانی من لەبارەی منەوە پرسیاریان لێ کردیت، بێگومان من لێیانەوە نزیکم، نزای نزاکاران گیرادەکەم هەرکاتێك هاوار و نزام لێ بکەن، دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن و بڕوام پێ بهێنن بەڵکو ڕێی ڕاست بدۆزنەوە.

دڵخۆش بوون بە خودا بێ هۆکار نابێ، بێ ڕەنج و ماندووبوون نایێتە بەر بەڵکو دڵخۆش بوون بە ملکەچی و پەرستن بەرەنجامی خۆشەویستییە، ئەوەی ملکەچی فەرمانی خودا بێ و فەرمانەکانی بەجێ بگەیەنێ و خۆی لە قەدەغەکراوەکانی بەدوور بگرێ و لە خۆشەویستییەکەی ڕاست بکا، لەم نزیکییە تام و چێژی دەست دەکەوێ، لە نوزانەوە و دوعاکانی بەختەوەری بۆ پەیدا دەبێت.

درەوشانەوە: جوانی هەر جوانی ڕەوشتە، باشی هەر باشیی ئەدەبە، پلە و پایەش هەر پایەی عەقڵە.

ناوبڕ: دوعا مەپچڕێنە چونکە پەتی ڕزاگرییە.

**بریسکە: وەسیەت بێ لەگەڵ ئافرەتان باش بن**

## ئەنگوستیلەی دەیەم: خاوەن دوو پشتێن دوو جار دەژیێ

ئـــەوەی نـــاخی جـــوان نەبێ
لەو دونیایەی یەك شتی جوان نابینێ

**ئەسمای کچی ئەبوبەکر (ڕەزای خودای لێ بێ) نموونەیەکی زیندوو و جوانمان لەبارەی ئارامگرتن لەسەر سەختی و تاڵییەکانی ژیان و پێداگری لەسەر گوێڕایەڵی هاوسەر و بەدەست هێنانی ڕەزامەندی هاوسەر بۆ دێنێتەوە. لە فەرموودەیەکی سەحیحدا هاتووە، ئەسما دەفەرمووێ: زوبێر منی خواست، هێ لە ئەسپێك هیچی تری نەبوو ئەویش من سەروکارم دەکرد و دەم لەوەڕاند. ناوکە خورمام بۆ وشتر دێنا و ئاوم دەدان و هەویرم دەشێلا. ڕۆژێ لە زەوییەکەی زوبێر کە پێغەمبەرﷺ دابویێ، ناوکە خورمام دێنا، پێغەمبەرﷺ کەسێکی لەگەڵ بوو، بانگی کردم و یخەی لە وشترەکە کرد و منیش لە دواوەی سوار بووم و زۆریشم شەرم کرد، زوبێر و غیرەتی زوبێرم بە بیرهاتەوە. گەیشتینەوە ماڵ و پێغەمبەرﷺ ڕۆیی. گەڕامەوە ماڵ و هەموو سەرو سەربردەم بۆ زوبێر گێڕایەوە. زوبێر گوتی: وەڵاهی کۆکردنەوەی ناوکە خورمایانم زۆر بەلاوە ناخۆشترە لەوەی**

لە دواوەی پێغەمبەرﷺ سوار بووی. جا ئەسما دەڵێ: وا بوم تا ئەبوبەکری باوکم بەردەستێکی بۆ ناردم تا سەروکاری ئەسپەکە بکا، هێندەم پێ خۆش بوو وام دەزانی لە دیلی ڕزگار بوومە.

دوای ئەو هەموو ئارامگرتنە، دەرگای نیعمەت لەسەر خۆی و هاوسەرەکەی کرایەوە، بەڵام ئەسما بە دەوڵەمەندی لوت بەرز نەبوو، بەڵکو پتر دەست کراوە و بەخشندە بوو، هیچی بۆ سبەی هەڵنەدەگرت، کە نەخۆش کەوتبایە چاوەڕێی دەکرد تا چاك بێتەوە و ماڵ و سامان ببەخشێ، دەیگوتە منداڵ و خزمان: ببەخشن و خێرێ بکەن، چاوەڕێی پاداشتیش مەبن.

دەروشانەوە: ژیان لەبەر چاوی باوەڕداران جوانە، دوارۆژ لای لەخوداترسان خۆشەویستە، بەڵێ هەر ئەوانە بەختەوەرن.

ئەو وتە ناوازانەت لەبیربێ کە لە ڕێبازی یەکتاپەرستی و دەستگرتن بە فەرمانی خودا دانسقەن، لە پلەی کەمال و ڕێبازی چاکە، دانسقەیی لەپلیکانەی سەربەرزی و ڕەوشتی جوان. هیچ ناوازەییەك لەوە بەهادارتر و گەشتر نییە لەو وتە ناوازەی کە جوبرائیل بۆ پێغەمبەری ﷺ هێناوە، ئەویش: بەڵگە یەکلاکەرەوە و دەلیلی ئاشکرا و نیشانەی ڕونن.

**بریسکە: خەفەتیان بۆ مەخۆ و بەو فێڵ و پیلانانەش دەیکەن دڵتەنگ مەبە.**

## ئاوازەی یەکەم: کێ ئازیزترین کەستە؟

نـــەفس ئەوها دەبێ کە ڕایدێنی ئەگەر خواردنت دایێ تامەزرۆ دەبێت، ئەگەر نەتدایێ، ڕادێ و لەبیری دەچێ

**ئەوت لە هەمووان خۆشتر بووێ..!**

**قەت لە خۆت پرسیووە و لەنێو دڵی خۆت لێکتداوەتەوە ئایا چەندەت پێغەمبەرﷺ خۆش دەوێ؟ ئەرێ دەزانی بەڵگەی ئەو خۆشەویستییە ئەوەیە ئەو ئیشانە بکەی کە پێغەمبەرﷺ حەزی لێ بووە و لەو شتانە دووربکەویەوە کە ئەو قەدەغەی کردوون، چاو لە هەست و نەستی خۆت بکە و ڕووی هەست و سۆزت ـ یەکەم کەس لە خودا بێ ـ پاشان ڕووی خۆشەویستیت لەو کەسە بکە کە ئێمەی لە گومڕێیی دەرباز کرد. ئەگەر دەتەوێ لە بەهەشت پایەدار بیت، ئەو فەرموودەی پێغەمبەرتﷺ لەبیر بێ کە دەفەرمووێ: ((المرء مع من احبه)). واتە: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەیە کە خۆشی دەوێ، لێ لە هەموو بەڵگان لە پێشتر بۆ ئەو خۆشەویستییە ئەوەیە کار بەوشتانە بکەی کە خۆشەویستﷺ فەرمانی پێداوە، ئاخر چۆن دەگونجێ کەسێ پێی وابێ پێغەمبەریﷺ خۆش دەوێ و کار بە فەرمانەکانی**

ئەو نەکا، شوێنکەوتەی سونەت و قورئان نەبێ، دەست بدە یەکێك لە کتێبەکانی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ و بخوێنەوە، بڕوانە ڕەوشتی بەرز و فەرموودە شیرینەکانی بۆ لێبووردەیی و لەخوداترسان و دونیانەویستی، ڕەوشتی خۆت بگۆڕە تاکو بەڕەوشتی پێغەمبەرﷺ بچێ.

**درەوشانەوە:** ژنەکانی نوح و لوت ناپاکیان کرد و بێ ئەرزش بوون کەچی ئاسیا و مەریەم بڕوایان هێنا و ڕێزیان لێ گیرا.

**ناوبڕ:** نوێژ و قورئانخوێندن و زیکر ملوانکەی گەش و زێڕینن بۆ سینگ و بەرۆکت.

**بریسکە: بێگومان من لێیانەوە نزیکم نزای نزاکاران گیرا دەکەم هەر کاتێك هاوار و نزام لێ بکەن، دەی با ئەوانیش بەدەنگ منەوە بێن.**

## ناوازەی دووەم: بەختەوەری هیچ پێوەندی بە دەوڵەمەندی و هەژاریەوە نییە

دەوری زەمـــــانەی ئـــــەم دونیایـــە دەمترسێنی
چەندان شت هەبوون مەترسیدار بوون و ڕوویان نەدا

**بێرناردشۆ دەڵێ: پێش ئەوەی بتوانم لەسایەی قەڵەمەکەمەوە شتێك پەیدا بکەم هەرگیز ناتوانم بڵێم تامی هەژاریم کردووە، چونکە کتێبخانەیەکی زۆر گەورەم هەبوو ئەویش کتێبخانەی گشتی بوو لە مۆزەخانەی بەریتانی، باشترین تابلۆی هونەرییم لەبەردەست بوو لە نزیك گۆڕەپانی تڕافلگار، جا پارەم بۆچی بوو؟ جگەرە بکێشم؟ خۆ جگەرەکێش نیم، شامپانیا بخۆمەوە؟ خۆ دیارە من ناخۆمەوە. سی قاتی تازە و گرانبەها بکڕم تاکو بەهەڵەداوان خۆم بگەیەنمە داوەتی ئێوارەی نێو کۆشکان و ئەوان ببینم کە هەموو هەوڵی من ئەوەیە قەت چاوم بە چاویان نەکەوێ، ئەسپێك بکڕم؟ ئەسپ چەند مەترسیدارە. ئۆتۆمۆبێل بکڕم؟ بێزارم دەکا. ئێستا ئەوەندە پارە و سامانم هەیە دەتوانم هەموو ئەو شتانەی پێ بکڕم، بەڵام ناشیکڕم کە لە ڕۆژگاری هەژاری نەمکڕیبوو. بەختەوەری من هەر لەو شتانەیە کە لە ڕۆژگاری**

هەژاری بەختەوەریان دەکردم، ئەوانیش: کتێب خوێندنەوە و سەیرکردنی تابلۆ کە چێژی لێ وەردەگرم، بیرۆکە نووسینەوەیە. لە لایەکی تریشەوە من ئەندێشەی قوڵم هەیە، پێم شك نایێ هەرگیز حەوجێی شتێك بم زیاتر لەوەی چاوم داخەم تاوەکو خۆم لە جێیەکی وەها دابنێم کە خۆم پێمخۆشە، هەرچی بمەوێ لەنێو خەیاڵدا دەیکەم. کەوابێ ئەو شتە بێ نرخانەی وا لە شەقامی بۆند دەفرۆشرێن چ سوودی منی تێدایە؟!

درەوشانەوە: لە ماڵی خۆت بەهەشتێك لە دڵنەوایی دروست بکە نەك یاریگای شەڕەچەقە، بەڕاستی هێمنی ناز و نیعمەتی خودایە.

ناوبڕ: چۆن مافی خۆت لە خەڵکی دەوێ ئەوهاش مافی خەڵکی بدە.

**بریسکە: خودایە خانووێکم لە نزیکە خۆت لە بەهەشتێ بۆ دروست بکە**

## ناوازەی سێیەم: ئەرێ خودا لە کەسانی تر شایەنتر نییە تاوەکو سوپاسگوزاری بین

هیچ قـــوفڵێك نییە دواتر قـــــوفڵەکەی نەکرابێتەوە
هیچ ماڵێك نییە نەگۆڕێ و حاڵێکی تری بەدوادا نەیەت

**سوپاسگوزاری خودا جوانترین و ساناترین هۆی بەختەوەرییە و، مایەی سانەوەی سەر و مێشکە چونکە کاتێ تۆ سوپاسگوزاری خودا دەکەی ئەو ناز و نیعمەتانەی ئەوت دێتە بەرچاو و سوپاسی ئەو نیعمەتانە دەکەی کە خودا بەسەریدا ڕژاندووی و تۆش لێی سوودمەندی. یەکێك لە پێشینە چاکەکان دەفەرمووێ: ((ئەگەر دەتەوێ نیعمەتێکی خودا بزانی چاوت داخە))، بڕوانە نیعمەتەکانی خودای هەر لە بیستن و بینین و عەقڵ و ئاین و ماڵ و منداڵ و ڕۆزی و جوانی. هەندێ ئافرەت هەن بەچاوی سوك لەو نیعمەتانە دەڕوانن، بەڵام ئەگەر سەیری ئافرەتە هەژار و نەدار و نەخۆش و ئازاردراو و بێ ماڵ و حاڵەکان بکەن، ئەوا شوکرانەی خودا دەکەن لەسەر ئەو نیعمەتانەی بە ئێمەی بەخشیووە، ئەگەر لە ڕەشماڵێك یان لە هۆدەیەکی بە خشت و قوڕ یان لە بن دارێکی ئەو بینایانە بای چی؟ سوپاسی خودا بکە لەسەر ئەو بەخشینانە بکە، خۆت بەو ئافرەتانە بەراورد**

بکە کە لەش و لاریان یان عەقڵیان یان بیستنیان یان منداڵەکانیان توشی نەخۆشیەك بووە خۆ ئەوانە لە دونیایێ هەر زۆر زۆرن.

درەوشانەوە: ئەوانەی سك سوتاون بە وشەی جوان دڵیان بدەوە بە خێر و چاکە فرمێسکی هەژاران بسڕە.

ناوبڕ: ئەگەر لاپەڕەی ئەمڕۆی ڕۆژمێرت هەڵدایەوە بزانە تۆ ڕۆژێکی تەمەنت لەدەست چوو.

**بریسکە: ژیانی مرۆڤ هەر دەگۆڕێ**

## ناوازەی چوارەم: ئافرەتی بەختەوەر کەسانی دەوروبەری خۆی دڵخۆش دەکات

لـــە ژیـــان و مـــەرگت هـەر باڵا بووی
هەر بەڕاستی تۆ یەکێکی لە موعجیزەکان

**ئۆریزۆن سویت دەڵێت: ناپلیۆن بەختی هەبوو، پێش ئەوەی ببێتە سوپاسالار و دەست بە داگیرکردن بکا هاوسەرگیری لەگەڵ جۆزفین کرد، شێوازە نەرم و نیانەکەی، کەسایەتییە شیرینەکەی جۆزفین بۆ ناپلیۆن لە دڵسۆزی دەیان پیاو باشتربوو، لەپێناو بەدەست هێنانی پلە و پایە. جۆزفین شادمانی بڵاودەکردەوە، تەنانەت فەرمانی بەشێوەی ڕاستەوخۆ بە خزمەتکارەکانیشی نەدەدا، خۆشی لە یەکێك لە وتەکانی بۆ دەستەخوشکێکی ئەوەی ڕوون کردووەتەوە تەنیا لە یەك شوێن وشەی (دەمەوێت) بەکاردێنم ئەویش لەو کاتەی کە دەڵێم: دەمەوێت ئەوانەی لە دەوروبەری منن بەختەوەر بن. وەکو ئەوەی وۆڵت ویتمانی شاعیری ئینگلیز ئەم شیعرەی بۆ ئەو گوتبێ:**

**((لە بەیانیەکی جوان و پڕشنگداردا**

بە کۆڵانێدا تێپەڕی و

شکۆی سپێدەی

بە درێژایی ئەو ڕوبارە بڵاوکردەوە))

دۆستی ئازیزم هەر بەڕاستی سۆز و میهرەبانی، بەختەوەری لە نێوانمان بڵاودەکاتەوە، تەنانەت شتە بێ گیانەکانیش دەگرێتەوە. نەرم و نیانی جوانییەکی واتاییە هیچ سنوورێکی نییە، جوانی بۆ ئافرەت چەند گرینگە نەرم ونیانی بۆ پیاو ئەوهایە، بەڵام بە نەرمونیانی ئافرەت دەتوانێ چەندان و چەندان جار زیاتر خۆی جوانتر بکات.

درەوشانەوە: ئەرێ ئەو ئافرەتە بەختەوەرە کە جوانییەکەی خۆی پیشانی مرۆڤە سەگ سیفەتەکان دەدات و شۆخ و شەنگی خۆی بۆ خەڵکانی گورگ سیفەت وەدەردەخا!؟

ناوبڕ: تۆ فرمێسکی منداڵی خۆت دەسڕی ئەی کێ فرمیسَکی بێ باوکان بسڕێ!؟

**بریسکە: لە شێنەیی خودای بناسە ئەویش لە تەنگانە دەتناسێ.**

## ناوازەی پێنجەم: دڵنیا بە هەموو شتێك بە قەزا و قەدەرە

بە کەیفخۆشی، ناتوانی درێژە بەبەختەوەری بدەی
بە غەمـــانیش کەسی نادیـــار پـــەیدا نابێتەوە

**یەکێ لەو شتانەی (دیل کارینگی) لە بری ئیمان بوون بە قەزا و قەدەر باسی کردووە ئەوەیە، کە مرۆڤ ئەو کەسە بێنێتە پێش چاوی خۆی کە تووشی بەڵایەك بووە، وەکو چۆن گامێشێك یان بنەدارێك تووش دێ. کارینگی پاساوی هەیە لەوەی باسی قەزا و قەدەری نەکردووە، چونکە ئەو چارەسەرەی لەبەردەستی ئێمەیە بەر دەستی ئەو نەکەوتووە، با گوێ بگرین، کارینگی دەڵێ: جارێك ویستم ڕووبەڕووی شتێکی ئەستەم ببمەوە کە تووشی بووبووم، هەر بەڕاستی کاڵفام بووم، زۆر پرتەپرتم کرد و توڕە بووم، وەخت بوو شێت بم، چەند شەوێکم لە خۆ کردە جەهەندەمی خەوزڕان، دوای ساڵێك لەو ئازارە دەروونییە وازم لەم کارە ئەستەمە هێنا کە هەر لە سەرەتاوە دەمزانی هیچ ڕێچارێك بۆ گۆڕینی نییە، زۆر باشتر بوو ئەو دێڕە شیعرەی وۆڵت ویتمان جێ بەجێ بکەم کە دەڵێت:**

**((چەندە جوانە بەرەنگاری تاریکی و زریان و برسییەتی**

دەرد و بەڵا و ناخۆشی و لۆمە و سەرزەنشت هەڕەشە ببیتەوە وەکو چۆن ئاژەڵ و ڕەگی دار وا دەکەن)).

دوازدە ساڵی تەمەنی خۆم لەگەڵ مێگەلە ئاژەڵان بردووەتە سەرێ، هەرگیز مانگایەکم نەدیووە بێئومێد بێ، لەو کاتەی لەوەڕگە دەسووتێ، یان بەهۆی بێبارانی نەهات بێ، یان گایەکەی دۆستی لە مانگایەکی دیکە نزیك بووەتەوە. ئاژەڵ بەهێوری و لەسەرخۆیی ڕووبەڕووی تاریکی و زریان و برسیەتی دەبێتەوە، بۆیە زۆر بە کەمی تووشی تێکچوونی کۆئەندامی دەمار و برینی گەدە دەبن.

درەوشانەوە: هەر بیر لە سەرکەوتن و خۆشییەکان بکەوە، هەردەم ناخۆشی و بەڵایەکان لەبیر بکە.

ناوبڕ: چۆن زێڕ کەڵەکە دەکەی لە کاتێکدا هەتیوەکان لە برسان دەگرییێن؟!

**بریسکە: تەنیا خودا بەسە پێسپێردراو و چاودێر بێت.**

## ناوازەی شەشەم: ئوم عەمارە دەدوێ

جیهـــانێکە هـــەمــــــوو خـــێر و شەڕێك
سنووری خۆی هەیە و ماوەیەك دێت و دەڕوا

**نوسەیبەی کچی کەعب (دایکی عەمارە) ـ ڕەزای خودای لێ بێت ـ بەسەرهاتی ڕۆژی ئوحد دەگێڕێتەوە، دەڵێت: سەر لە سبیانێ چوومە دەرێ بزانم ئەو خەڵکە چی دەکەن، کوندە ئاوێکیشم پێ بوو، خۆم گەیاندە پێغەمبەرﷺ، دیتم لەگەڵ هاوەڵانە و ڕۆژ ڕۆژی ئەوانە. کە خەریك بوو موسڵمانان نسکۆ بێنن خۆم لە پێغەمبەریﷺ نزیك کردەوە و دەستم بەشەڕێ کرد، بە تیر و شیران بەرگریم لە پێغەمبەری دەکرد هەتا بریندار کرام. کە خەڵکی بڵاوەی کرد و پێغەمبەریانﷺ بەجێهێشت، ئیبن قوئەیمە هات و گوتی: موحەمەدمﷺ پێ پیشان دەن، بەس بزانم لە کوێیە، یان من دەبم یان ئەو، من و موسعەبی کوڕی عومەیر ڕووبەڕووی بووینەوە، جا ئیبن قوئەیمە لە شانی دام، ئەمنیش دامە بەر شیران لێ ئەو دوژمنەی خودای دوو زرێی پۆشی بوو.**

**ئا ئەمەیە ئوم عەمارە کە پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئەو فەرموویەتی: ((ما التفت یمینا و لا شمالا یوم احد الا و اراها تقاتل دوني)). واتە:**

لە ڕۆژی ئوحد ئاوڕم بەلای ڕاست و چەپدا نەدوەتەوە ئیلا بینیوومە وا ئەم ژنە شەڕ لەپێناوم دەکا.

درەوشانەوە: ئاگاداری دەمەقاڵە بە چونکە خۆماندووکردنێکی بەلاشە. خۆ لە جنێودانێ بەدوور بگرە چونکە سزا و ئازارە.

ناوبڕ: ئەوەی تین و تاوی ئاگری جەهەنەمی لەبیر بێ لەسەر نەکردنی گوناهان ئارام دەگرێ.

**بریسکە: نۆ لە دەی ڕەوشت بەرزی ئەوەیە هەڵەکان فەرامۆش بکەی**

## ناوازەی حەوتەم: چاکەکردن لەگەڵ خەڵکی غەم و خەفەتت ناهێڵێ

ئەگـــەر خودا سەراپای موڵکی زەوییت بداتێ
خەڵك چاوە پێ هەڵنایێ دەڵێن ئەوە چییە؟!

**فەرموودەی پێغەمبەرﷺ لەبارەی دەستکراوەیی ئافرەتان زۆرە، جا چ بە هاندان بێ لەسەر جوامێری و بەخشین، یا بە پێهەڵدان و هەڵگوتن بێ یان بە بەخشین بێ و ئەو دڵخۆشییەی ئافرەتان بێ، لە میوانداری دۆست و خۆشەویستان، دایکی بڕوداران عائیشە دەگێڕێتەوە: جارێك بەرخێکمان کوشتبووەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ئەرێ هیچی لێ ماوە؟ گوتم: هێ لە پیلێك هیچی نەماوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی هەمووی ماوە هێ لە پیلەکەی.**

**پێغەمبەرﷺ بۆ ماڵ و خێزانی خۆی ڕوونکردەوە ئەوەی بەخشیویانە و، کردوویانە بە خێر وپاداشت، لە ڕۆژی دوایی وەریدەگرن، ئەوەی بۆ ئەم دونیایە ماوە و دەیخۆن چ پاداشتی لەسەر وەرناگرن. ئەمە سەرنجێکی چەند جوانە کە هانی خێر و چاکە دەدات لەپێناو ڕەزامەندی خودا.**

ئەوەتا خاتوو ئەسمای خوشکی عائیشە(ڕەزای خودای لێ بێت)دەفەرمووێ: پێغەمبەرﷺ ئامۆژگاری کردین ببەخشین، بەڵکو خودا پاداشتمان بۆ زیاد بکا، ئەسما دەڵێت پێغەمبەرﷺ پێی فەرمووم: درێغی مەکە لە بەخشین با خودا لێت وەرنەگرێتەوە، لە گێڕانەوەیەکی دی خێر بکە و ببەخشە هەر مەیژمێرە خودا بۆت دەژمێرێ، بە ڕووی کەس دامەدەوە نەوەك خوداش بەسەرت داداتەوە.

درەوشانەوە: لەبەرئەوەی شەو دەگوزەرێ، ئازار و غەمیش دەڕۆن و، قەیرانیش تێدەپەڕێ و، سەختی و ناڕەحەتیش نامێنێ.

ناوبڕ: لە گۆتەگۆتێ (قسەوقسەڵۆك) دوور بکەوە، کردەوەت هەیە هێندەی شاخێکە.

**بریسکە: نیعمەت بوکێکە و مارەییەکەی سوپاسگوزارییە.**

## ناوازەی هەشتەم: زیانەکانت بکە قازانج

ئـــەی خودایە ڕۆحمان لەسەر لەپی دەستە
لەتۆوەش پاداشتی زۆر و زەوەندمان دەوێ

**ئامۆژگاری کرد و گوتی:**

**ئەگەر قاچت نەترەی برد و کەوتییە نێو چاڵێکی فراوان، بێئومێد مەبە هەر زوو بەهێز و گوڕێکی زیاترەوە لەو جێیە دێیتە دەر، خودا لەگەڵ ئارامگرانە.**

**غەمبار مەبە ئەگەر لە نزیکترین کەستەوە تیرێکی کوشندەت بۆ هات، یەکێ دێ و تیرەکە دەردێنێ و، برینت سەرڕێژ دەبێ و ژیان و خەندەت بۆ دەگەڕێتەوە.**

**لە کۆنەهەواران زۆر مەوەستن بەتایبەتی ئەگەر شەمشەمەکوێرە لانەیان چێکرد بوو، تارماییش ڕێ و ڕێبازیان داگرت بوو، بەدوای دەنگی بولبولان بگەڕێ کە موژدەی ئاسۆی ڕۆژێکی نوێ دەدەن.**

**مەڕوانە ئەوپەڕە کاغەزانەی زەردهەڵگەڕاون و پیتەکانیان سڕاونەتەوە و، دێڕەکانیان بەهۆی دوورەدەستی ناخوێندرێنەوە، بەم نزیکانە بۆت دەردەکەوێ ئەم دێڕانە جوانترین شت نیین کە تۆ**

نووسیووتە، ئەم کاغەزانەش کۆتا شت نین کە نووسیووتە، دەبێ ئەو کەسە جوێ بکەیتەوە لەو کاتەی ئەو دێڕانەی نووسیووە و لەو کەسەی کە ئەوەتانێ کاغەزەکە هەڵدەداتە بەر با، ئەم دێڕانە تەنیا چەند پەیڤێکی جوان نیین، بەڵکو هەستی دڵێکن کە لەگەڵ پیت بە پیتی ئەو دێڕانە ژیاوە، تەپەی دڵی کەسێکن کە خەونێکی هەبوو، بە ئاگری ئەو دێڕانە زامدار بوو، مەبە شینە شاهۆ، ئەم باڵندەیە هەتا خوێنی زیاتری لەبەر بڕوا خۆشتر دەخوێنێ، هیچ شتێ لەم دونیایە دڵۆپە خوێنێکی تۆ ناهێنێ.

درەوشانەوە: ئەوەی با بچێنێ، گەردەلول دەدورێتەوە.

ناوبڕ: دووزمان لەبەر دڵان ڕەشە، پاشملەکاریش تاوانبارە.

**بریسکە: دەڵێی مرواری نێو سەدەفن.**

## ناوازەی نۆیەم: وەفا زۆر بەنرخە، ئەرێ وەفاداران لە کوێن؟

پیـــــاو پیـــــاوی قســــــەی دوای خۆیەتی
بۆیە کە لەگەڵ کەسێ دانیشتن قسەی باش بکەن

**ئەیوب پێغەمبەر (علیه السلام) یەکێك بوو لە گەورە خوداناسان و، ئەوانەی خۆیان داوەتە دەست خودا و بە حوکمی خودا ڕازین. ئەیوب لەجەستە و ماڵ و منداڵ تووشی زەرەرمەندی بوو، تەنانەت هێندەی سەرە دەرزییەك لە جەستەی بە سەلامەتی نەما جگە لە دڵی. هەرچی خودا بە بەنیادەمی داوە لەو دونیایەی نەیما تاوەکو لەو نەخۆشییی و بارودۆخەی سوودی لێ ببینێ، جگە لە خێزانەکەی ئەویش بەهۆی باوەڕەکەی بە خودا و بە پێغەمبەرﷺ. ئەم ئافرەتە هەژدە ساڵان بە کرێ خزمەتکاری دەکرد و خواردنی دەدایە ئەیوب و خزمەتی دەکرد. مەگەر بۆ خزمەتکاری ڕۆیشتبا ئەگەر نا شەو و ڕۆژ لێی دوور نەدەکەوتەوە، هەرکە لە خزمەتکاری ماڵان تەواو ببا یەکسەر دەهاتەوە لای ئەیووب، ئەم بارودۆخە درێژەی کێشا و وەزعیان شڕ بوو، ئیدی کاتی خۆی هات و ئەیوب فەریاد و ناڵەیەکی لە دڵی ڕا بۆ خودای جیهان و پەروەردگاری پێغەمبەران و زاتی بەخشندە**

و دلۆڤان بەرز کردەوە و، هاواری کرد: [وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ] (الأنبياء :٨٣)

واتە: (باسی) ئەیووب (بکە) کاتێ هاواری لە پەروەردگاری کرد (لە دوای ناساغی ماوەیەکی زۆر) بەڕاستی من زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم بووە و تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی.

هەر زوو خودا دوعایەکەی گیرا کرد، بە هانای چوو، خودا فەرمانی بە ئەیوب کرد لە شوێنی خۆی هەڵبستێ و پێ لە زەوی بدا، ئەیوب هەستا و وایکرد، کانییەك هەڵقوڵا، خودا فەرمانی دا خۆی تێدا بشوا، هەرچی دەرد و نەخۆشی هەبوو لە جەستەی نەما، پاشان فەرمانی پێکرد لە شوێنێکی دیکە پێ لەزەوی بدا، ئەیوب وایکرد و کانییەکی دیکە دەربوو، فەرمانی کرد بیخواتەوە، ئەیوب خواردییەوە، هەرچی دەرد و ئازارهەبوو لەنێو هەناوی نەما، لە ناوەوەو دەرەوە چابووەوە، ئەم هەموو شتە بەروبوومی ئارامگرتن و خۆڕاگریی و سوود و ئەنجامی ڕەزامەندییە.

درەوشانەوە: بەدڵنیایی مرۆڤ لەپای قسەکردنی پەشیمان دەبێتەوە بەڵام کەم کەس لەسەر بێدەنگی بەداخ بووە!

ناوبڕ: بە فرمێسکی تۆبە، سورمەی تاوان بشۆ.

**بریسکە: ئافرەت سەرچاوەی دڵخۆشیی و کانگەی کەیف و خۆشییە**

## ئاوازەی دەیەم: هەتەر (جدی) بە.. هەتەر[1]

بەدەم بەیـــــانی پێبکەنەو بڵێ: ئەك
بەخێربێی ئێمە تینووی دیدارت بووین

**ئیش و کارەکانت بەدڵ بکە، جا هەر لە پەروەردەکرنی منداڵ و گەڕان بەدوای ئیش و کاری بە سوود و کەڵك و، خوێندنەوەی بەسوود و، قورئان خوێندن و نوێژی بەمانا و، زیکری سپی و خێر و بەخشین و ڕێکخستنی ماڵ و کتێبخانە، تا بەوشتانە غەم و خەفەتەکانت لێ دوور بکەوێتەوە.**

**تۆ بڕوانە ئەم ژنە بێباوەڕانە لەگەڵ ئەو لادان و بێ باوەڕییەی هەیانە لە ژیانیان چەند هەتەرن، ئەوەتا سەرۆك وەزیرانی پێشووی ئیسرائیل (گۆڵدا مایەر) لە یاداشتنامەکەی چۆن باسی شێلگیری و ڕێکخستنەوەی سوپا دەکا. باسی هەڵوێستی خۆی لە شەڕەکانی لەگەڵ عەرەب دەکا، ئەو ئیشەی بەم ئافرەتە کراوە بە کەم پیاو دەکرێ!**

**درەوشانەوە: بەختەوەری بەشێك نییە لە جادوو، ئەگەر وا بوایە هێندە بەنرخ نەدەبوو.**

**نـــاوبـــڕ: ئافرەتی بڕودار لە خـــۆر جوانترە چونکە بە خوداپەرستی ڕێزلێگیراوە.**

---

**(١) جدی: هەتەر، لێبڕاو، شێلگیرانە..**

مەرجان لە بنەبنەی دەریاکان دەردەهێندرێ تاوەکو بە گەردەن وەبکرێ، بەڵام ئەو مەرجانەی کە لە سیدرەتولمونتەها لە خزمەت باری تەعالا هاتووەتە خوارێ زۆر بەسوودتر و بەکەڵکترە، چونکە مەرجانی سەر زەوی ئافرەتانی بێباوەڕ و ڕووت و خراپ دەیپۆشن بەڵام مەرجانی ئاسمانی تەنیا ئافرەتانی پاك و خۆپارێز و خۆشنوود دەیپۆشن.

**بریسکە: بەڕاستی خودا لەگەڵ ئەوانەیە کە خۆیان پاراستووە (لە تاوان) هەروەها ئەوانەش کە چاکەکارن.**

## مەرجانی یەکەم: بەئازایی لەگەڵ نەفسی خۆت بوەستە

بـــرسییەتی بە ئەستوورکێکی وشك نامێنێ کەوابێ
ئەو هەمـوو حەسرەت و دوو دڵییە لە پای چی!؟

**ئەم پرسیارانە لە خۆت بکە و بە ژیری و لێزانی وەڵامیان بدەوە:**

**ـ ئایا دەزانی تۆ گەشتێکی بێ گەڕانەوە دەکەی؟.. ئەرێ خۆت بۆ ئەم سەفەرە ئامادەکردووە؟**

**ـ ئەرێ لەم دونیایە پوچەدا بایی خۆت توێشووت هەڵگرتووە و کاری چاکت کردووە هەتا لەنێو قەبر هاونشینت بێت؟**

**ـ تەمەنت چەندە؟ چەندی دەژی؟ ئایا دەزانی هەموو سەرەتایەك کۆتایی هەیە، کۆتایی یان بەهەشتە یان ئاگر؟**

**ـ ئەرێ قەت هاتووەتە مێشکت کاتێ فریشتە بۆ نسکۆی ڕۆحت لە ئاسمانەوە دادەبەزن تۆ لەو کاتە بێئاگا بیت و لە ڕابواردنێ بیت؟**

ـ ئاخۆ هەرگیز دوا ڕۆژ و کاتژمێری ژیانی خۆت هاتووەتە بەرچاوی، کات و ساتی لێکدابڕان لە ماڵ و منداڵ و دوورکەوتنەوە لە دۆست و ئازیزان؟ ئەوە مردنە بەو هەموو سەختی و ناخۆشییەوە، بەڵێ، ئەوە مەرگە .. مەرگ!!

دوای ئەوەی ڕۆحت لە جەستە جیابووەوە، دەتبەنە سەر تاتەشۆر و دەتشۆن و کفنت دەکەن، دەتبەنە مزگەوتێ و نوێژت لەسەر دەکەن، پاشان بە چەند پیاوێك هەڵتدەگرن بۆ کوێ؟

بەرەو گۆڕ، یەکەم مەنزڵگەی دوارۆژ، جا ئەو گۆڕە یان مێرگێکە لە مێرگەکانی بەهەشت یان چاڵێکە لە چاڵەکانی ئاگر؟

درەوشانەوە: وانە لە شکستەکانت وەربگرە.

ناوبڕ: هەردووکی هەر ماڵن: ماڵی زکر و قورئان، ماڵی گۆرانی و ڕابواردن!

**بریسکە: خودا ئەو زاتەیە کە باران دەبارێنێ لەپاش ئەوەی کە خەڵکی نائومێد بوون**

## مەرجانی دووەم: وریا بە

دڵــم پێش ڕوودانـــی شتێك پڕ نابێ و غەمی بۆ ناخۆم خۆ ئەگەر شتەکە ڕوویدا و تێپەڕی خۆمی بۆ دڵتەنگ ناکەم

**ئاگادار بە خۆت بە پیاوان و بێباوەڕان و ئافرەتی خراپ مەچوێنە، لە فەرموودەیەك هاتووە: ((لعن الله المتشبهين من الرجال بالنساء، و المتشبهات من النساء بالرجال)). واتە نەفرەتی خودا لەو پیاوانەی خۆیان بە ژنان دەچوێنن و نەفرەت لەو لەو ژنانەش خۆیان بەپیاوان دەچوێنن)، وریای هەموو ئەو شتانە بە کە خودا توڕە دەکا، ئەو شتانەی کە لە فەرموودەدا قەدەغەکراوە، مانەوە لەگەڵ پیاوی بێگانە یان گەشت لەگەڵ کەسانی نامەحرەم، یان بێ شەرم و بێ ئابڕوویی و خۆڕووتکردنەوە و فەرامۆشکردنی خودا، هەموو ئەم شتانە دڵ تێکەڵ و پێکەڵ دەکەن و دڵتەنگی دروست دەکەن و دەبنە تاریکی دونیا و دواڕۆژ، بەداخەوە ئەم شتانە ئێستا لە نێو ئافرەتانی موسڵمان بەربڵاوە هێ لەوانەی خودا ڕەحمی پێکردوون.**

**درەوشانەوە: بۆ ئەوەی جوان بی دەبێت بەجوانی بیر بکەیتەوە.**

**ناوبڕ: چاکترین ژیاننامە بە کردەوەی چاك و ڕەوشتی جوان تۆمار بکە.**

**بریسکە: ئەی پەروەردگارمان لە گوناهو زیادەڕەویمان لە کاروبارماندا ،ببورە**

## مەرجانی سێیەم: سوپاسگوزاری چاکەکاران ئەرکە

ئەگـەر لەگەڵ ناخی خۆت دوواى، ڕاستی پێمەڵێ
ئەگـــەر نەفس ڕاستی کرد هیوای بۆ بچوك کەوە

**(خەیزەران) کەنیزەك بوو، خەلیفە مەهدی لە کۆیلەفرۆشانی کڕیبوو، ئازادی کرد و لە خۆی مارەکرد، هەموو فەرمانێکی ئەو ژنەشی جێبەجێ دەکرد، دوو کوڕی ئەم ژنەشی کردە خەلیفەی جێنشین، ئەوجا کاتێك خەیزەران لە خەلیفەی توڕە بووبایە پێی دەگوت: لە ژیانی خۆم خێر و خۆشییەکم لە تۆ نەدیووە!**

**بەهەمان شێوە (بەرمەکییە) دیلێك بوو، دەکڕدرا و دەفرۆشرا. تاوەکو پاشای مەغریب موعتەمیدی کوڕی عەباد کڕی و ئازادی کرد و کردییە شاژن، بەرمەکییە وەختایەك دیتی وا ژن و ژاری کارەکەر یاری بە قوڕێ دەکەن، هەوای زەمانی خۆی بزووت و حەزی لێ بوو وەکو وان گەمان بە قوڕێ بکا، پاشا فەرمانی دا برێکی یەکجار زۆری گوڵ و عەتری لە شێوەی قوڕ بۆ ساز بکرێ تا شاژن خۆی پێ بخافڵێنێ. سەرەڕای ئەو هەموو چاکەیە کاتێ بەرمەکییە لە پاشا توڕە دەبوو دەیگوت: قەت خێر و خۆشییم لە تۆ**

نەدیووە. پاشاش پێدەکەنی و دەیگوت ڕۆژی قوڕەکەش؟! شاژن ئارەقەی دەکرد لە شەرمان!

ئەوە سروشتی ئافرەتان ئاوایە ــ بێجگە لە کەمێکیان نەبێ ــ ئەگەر هەڵەیەك یان کەموکوڕییەك ببینن هەموو ئەو شتانەیان لەبیردەچێ کە لە پێناویان کراوە. لە فەرموودەی خۆشەویست ﷺ هاتووە: ((ئەی گەلی ئافرەتان خێر و چاکە بکەن چونکە بینیم زۆرینەی دۆزەخییەکان ئافرەت بوون، ئافرەتان گوتیان: جا بۆ وایە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟ فەرمووی: زوو نەفرینان دەکەن و زۆر پچك و پەلاران داوێن، لەگەڵ دۆستی چاك بێ ئەمەکن)).

و قال ﷺ ((اريت النار فاذا اكثر اهلها النساء، لانهن يكفرن العشير و يكفرن الاحسان، لو احسنت الى احداهن الدهر ثم رات منك شيئا، قالت: ما رايت منك خيرا قط)).

ئەگەر کەسێك سروشتی ئافرەتی ناسی هەرگیز توڕە نابێ و دەماری جووت نابێ لەو کاتەی ئافرەتێك نکوڵی بکا و بڵێ: من هیچم بۆ نەکراوە.

درەوشانەوە: ئافرەتی سەرکەوتوو ئەو ئافرەتەیە هاوسەرەکەی دوعای بۆ دەکا و پێی داهەڵدەڵێ، دراوسێیەکانی خۆشییان دەوێ و دەستەخوشکەکانی ڕێزی دەگرن.

ناوبڕ: هەموو خولەکێ (استغفرالله) بکە و لە هەموو قسەیەکت (سبحان الله) یەك بڵێ.

**بریسکە: ڕەحمەتی خودا توڕەیی ئەوی گرتووەتە خۆی**

## مەرجانی چوارەم: بۆ چاودێری ڕۆح لە جەستە لەپێشترە

بەهـــــار بە شانـــــازییەوە هـــات و پێدەکەنێ
هێندە بەو جوانییەی خۆی شادە وەختە بدوێ و بزە بکا

**عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە سەردەمی خەلیفایەتی خۆیدا بە پیاوێکی گوت: کراسێکم بە هەشت درهەمان بۆ بکڕە. کابراش کراسەکەی کڕی و هێنای، عومەر دەستی خستە سەر کراسەکە و گوتی: وەی چەند نەرم و جوانە! کابرا کرژیەوە، عومەر لێی پرسی: کابرا ئەوە بە چ پێدەکەنی؟ کابرا گوتی: قوربان پێش ئەوەی ببیە خەلیفە جارێك فەرمانت پێدام عەبایەکی ئاوریشمت بۆ بکڕم، منیش عەبایەکم بە هەزار درهەم بۆ کڕی، جا دەستت لەسەر دانا و گوتت: ئۆی چەند دڕە دڕ! ئێستاش ئەو کراسە هەشت درهەم باییەت بەلاوە نەرمە؟**

**جا عومەر فەرمووی: پێم وایە ئەو پیاوەی کراسێك بە هەزار درهەم دەکڕێ لە خودا ناترسێ، پاشان فەرمووی: کاکە من نەفسێکم هەیە حەزی بە پلە و پایەیە، هەر کاتێ دەگەمە پلە و پایەیەك داوای بەرزتر دەکا، کاتێ بوومە میر دنەی دەدام ببمە خەلیفە، کە بوومە خەلیفە ئەوجارە نەفسم بە خەلیفایەتیش ڕاناوەستێ و ئارەزووی لە بەهەشتە.**

درەوشانەوە: بڕیاردان لەسەر خەڵکی لە ئەستۆی ئێمە نییە، کوا ئیشی ئێمەیە بیر لەسزادان و تۆڵەی ئەوانی دی بکەینەوە.

ناوبڕ: جوانییەکەی خۆت لەگەڵ خۆتدا ببە گۆڕ.. تەقوا

**بریسکە: سنووری خودای بپارێزە خودا دەتپارێزێ**

## مەرجانی پێنجەم:
## نان ئەو نانە ئەمڕۆ لە خوانە

دەخیلت بـــم کوڕی ئەمڕۆ بە فەردا وا دەکەم هیچە
چ فەرداها تیا نەکراوە کارێك و بووە دوێنێ (مەحوی)

**لەخۆدان و پرچ ڕنینەوە و بەرۆك دڕاندن بۆ کەسەر و غەمی ڕابردوو چ سوودی هەیە، ئاخەر چ بەهایەکی هەیە مرۆڤ هەموو بیر و ئەندێشەی خۆی بخاتە سەر ڕووداوێك کە تازە بەسەرچووە، بەباکردنی کۆنە کایان، غەم و دڵسوتانت بۆ زیاد دەکات؟!**

**ئەگەر لە دەستمان هاتبا و دەستێکمان گەیشتبایە ڕابردوو هەتا بتوانین ڕووداوەکانی بەرێ بگۆڕین و بەدڵی خۆمان دەسکاری بکەین، ئەوا گەڕانەوە بۆ ڕابردوو ئەرك بوو، هەموو بەهەڵەداوان خۆمان دەگەیاندێ، ئەو ئیشەی لێی پەژیوانین دەمانسڕییەوە. لە هەر شتێ بەشمان کەم بوو زیادمان دەکرد، بەڵام ئەو شتە ئەستەمە، بۆ ئێمە وا باشە هەموو هەوڵ و تەقەلای خۆمان لەگەڵ ڕۆژگار و شەوگاری ئێستامان بدەین، هەنوکە دەتوانین جێگرەوەیەك وەدۆزیین.**

فەرموو ئەوە ئاگاداری قورئان پاشی سەربوردەی ئوحد خودا بە جەرگسووتاوی کوژراوەکان و خەجاڵەتمەندەکانی ڕاکردووانی فەرموو: [قُلْ لَوْ كُنْتُمْ فِي بُيُوتِكُمْ لَبَرَزَ الَّذِينَ كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقَتْلُ إِلَى مَضَاجِعِهِمْ وَلِيَبْتَلِيَ اللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ] (آل‌عمران :١٥٤)

واتە: بڵێ ئەگەر ئێوە لە ماڵەکانی خۆشتاندا بوونایە هەر دەردەچوون، ئەوانەی کوژرانیان لەسەر نووسرا بوو بۆ جێگای کوژرانیان (ڕاکشانیان) بۆ ئەوەی خودا تاقی بکاتەوە ئەوەی کە لە سنگتاندایە و بۆ ئەوەی پاڵفتە و پاکی بکاتەوە ئەو(بڕوایە) ی کە لە دڵتاندایە و خودا زانایە بەوەی لە سینەو دەروونەکاندایە.

درەوشانەوە: دڵنیا بە بەختەوەری وەکو گوڵێکی چێنراو هێشتا خونچەی نەکردووە بەڵام بەدڵنیاییەوە هەر شین دەبێ.

ناوبڕ: با هەوڵ و کۆششت بۆ زێڕ و خشڵ و ئاهەنگ نەبێ، بەڵکو لە چاکەکردندا بێت.

**بریسکە: هەر کەسێ ڕوو وەرگێڕێ لە یادی من ئەوە بێگومان ئەو کەسە گوزەرانێکی سەخت و تەنگی دەبێت**

## مەرجانی شەشەم: تەنگ و چەڵەمە گەنجینەی ویستەکانن

سبەی بە ڕووێکی خۆش لەو مێرگە جوانە بڕوانە
وا باڵندە گـــــۆرانی بـــۆ دەڵێ و دەخـــوێنێ

**لە ئوم عەلاوە (ڕەزای خودای لێ بێت) دەگێڕنەوە فەرموویەتی: ((ابشري يا ام العلاء، فان مرض المسلم يذهب الله به خطاياه كما تذهب النار خبث الفضه)) واتە: من نەساغ بووم و پێغەمبەرﷺ سەردانی کردم و فەرمووی: ئەی ئوم عەلا موژدەت لێ بێ، چونکە خودا بەهۆی نەخۆشی موسڵمان تاوانان ڕادەماڵێ وەکو چۆن ئاگر خڵتەی زیوو ناهێڵێ).**

**خۆ ئەوە بەو مانایە نایێ ئێمە خۆمان تووشی میکرۆبی نەخۆشییان بکەین و چارەی نەخۆشان نەکەین بە بیانووی ئەوەی نەخۆشی گوناهـ و تاوانان دەسڕێتەوە، بەڵکو لەسەر بەندە پێویستە داوای زوو چاك بوونەوە بکات و دەرمان بەکاربێنێ، هەروەها لەسەر نەخۆشی ئارام بگرێ و لە خوداوەی بزانێ.**

**ئەوها لە نەخۆشی بڕوانێ کە ئەم نەخۆشییە لە تۆماری چاکەکانی ڕەسیدە، ئەوەیە کە ئێمە لەم خانمە چاکەکارە فێری دەبین.**

لەسەر ئافرەت پێویستە لەکاتی لەدەستدانی مێرد و منداڵەکانی ئارام بگرێ، ئەوەتا لە فەرموودەیەك هاتووە: ((ان الله لا یرضی لعبده المؤمن، اذا ذهب بصفیه من اهل الارض فصبر واحتسب، بثواب دون الجنة)). واتە: خودا بە کەمتر لە بەهەشت بۆ بەندەی خۆی ڕازی نابێ، ئەگەر خۆشەویستێکی لەو بەندەی خۆی دابڕی و بەندەکەش ئارامگر و خۆڕاگر بوو، بە پاداشتێ جگە لە بەهەشت.

ئەگەر ئافرەتێك بێوەژن بوو، خودا پیاوەکەی بەرەو دلۆڤانی خۆی بردەوە، خودا بۆ ئەم پیاوە نزیکتر و لەپێشترە، جا ئەگەر ژنەکە گوتی: هۆ مێردە باشەکەم ڕۆ، وەی ڕۆڵە ڕۆ! خودای ئافەرێنەر دەفەرمووێ: بەندەی خۆمە و من لە هەموو کەس پتر لەو نزیکم، مافی منی بەسەرەوەیە نە کەسی تر. مێرد قەرزە، کوڕ سپاردەیە، برا دەستخوازە، باوك وامێکە، ژن ئەمانەتە.

ماڵ و خێزان سپاردەن، هەر دەبێ ڕۆژێك ئەو سپاردانە بگێڕییەوە.

درەوشانەوە: وەکی چۆن لە تاعونێ ڕادەکەی ئاواش لە جوێندانێ هەڵێ.

ناوبڕ: کتێبخانەیەکی بچوك لە ماڵەوە دروست بکە چونکە ڕۆحی ماڵە.

**بریسکە: خودا بەزەیی بە میهرەبانەکاندا دێتەوە.**

## مەرجانی حەوتەم: بەزەییت بەوانەدا بێتەوە لەسەر زەویین ئەوەی لە ئاسمانە بەزەیی پێتا دێتەوە

نەتزانیووە هەموو ناخۆشییەك، خۆشییەكی لەدوایە
وەکو چــۆن ئـــــارامگرتن دەرووی خێری لەدوایە

**لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ سۆز و دلۆڤانی دایك بۆ منداڵەکەی بە ڕوون و ئاشکرایی پیشان دراوە، کە ئەمەش نموونەی سۆز و دڵناسکییە، کانی دڵنەرمیی و میهرەبانییە کە خودا هەڵیقوڵاندووە، تا بۆ ڕۆڵەکانیان دەربن. بەخشین و هاوکاری پێغەمبەر ئەو نمونە زیندووانەی بۆ ڕوونکردنەوەی ڕەحمەتی خودا بۆ بەندەکانی پیشان داوە. لە میری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب(ڕەزای خودای لێ بێت) دەگێڕنەوە، هەندێك ئافرەتی کەنیزەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ. پێغەمبەرﷺ بینی یەکێ لەو کەنیزانە دەگەڕێ. منداڵێکی بچوکی لەنێو یەخسیرەکان دیتەوە، لە باوەشی خۆی کرد و شیری دایێ، جا پێغەمبەرﷺ فەرمووی ئەرێ پێتان وایە ئەم ژنە ئەو منداڵەی خۆی باوێتە نێو ئاگرێ، گوتمان: ناوەڵا، فەرمووی: خودا بۆ بەندەکانی خۆی لەو ژنە بەڕەحمترە بۆ منداڵەکەی.**

ئەم ژنە دیل و دڵتەنگە، لە ماڵ و حاڵی خۆی خانومان بووە، لەکن مێرد و هۆزی خۆی سەرگەڤاز بووە. ئێستەش بووەتە یەخسیر و بەرفەرمان، بارودۆخی دەروونی ئەم ژنە لە حاڵێکی زۆر شڕ و شەپڕێو دایە، غەمی سەر دڵی سەختە، کەچی ئەو بارودۆخە وای لەم ژنە نەکرد ئەو پارچە جەرگەی خۆی، ئەو کۆرپەی خۆی لەبیر بکا، بە هەموو تین و تاوی لەدوای وێڵ بوو تاوەکو دۆزییەوە و لە ئامێزی خۆی کرد و مەمکی دایێ و بە سینگی خۆیەوە ڕایگووشی. ئافرەتێك لەو حاڵەدا دەستی لەو کۆرپەی خۆی هەڵنەگرت، لەو تەنگانەیە کوڕەکەی خۆی لە ناخۆشی و برسییەتی ڕزگار کرد و خۆی بە ساقەی دەکرد.

درەوشانەوە: زمانی خراپ هێندەی زیان بۆ سەری خۆی هەیە هێندە زیانی بۆ زمانلێدراوەکە نییە.

ناوبڕ: دوای ئەوەی تۆبە و ئیستیغفارت بۆ خۆت و موسڵمانان کرد ئەوسا بخەوە.

**بریسکە: سوپاسگوزاری پارێزبەندییە لە ناخۆشیی**

## مەرجانی هەشتەم: ئەم دونیای جوانە هەر تەنێ گەشبینەکان دەیبینن

سەڵاواتی خودات لەسەر بێ ئەی بەیداغی ڕێنمایی
ڕۆژگـــــــار مـــــوژدەی هـــــاتنی تـــۆ دەدا

**ئەگەر زستان دەرگەی ماڵیی داخست، ئەگەر کەوییە بەفر هەموو لایەکی لێ گرتی، چاوەڕوانی هاتنی بەهارێ بە، پەنجەرەکان بۆ کزەبای هەوای پاکژ بکەوە. دوور بڕوانە بەڵکو باڵندان ببینی کە دێنەوە و دەچریکێنن، خۆرەتاوێ دەبینی وا شەوق و شەبەنگێ زێڕینی لەسەر لکەداران دەداتەوە هەتا تەمەنێکی نوێ و، خەونێکی تازە و دڵێکی نوێت پێ ببەخشێ.**

**بۆ دار و درەختی جوان گەشتی بیابانێ مەکە، لە بیابانێ هێ لە ترس و تەنیایی چی دی نییە، تۆ بڕوانە ئەو سەدان دار و بارەی وا سێبەریان دەورەی داوی، بەروبومیان شادمانت دەکەن، ئەو خۆشییەی کەوا باڵندەکان لەوێ لانەیان داناوە.**

**هەوڵ مەدە کۆنە کایان شەنەبا کەی و حەسرەتی بۆ هەڵکێشی، ئەگەر گەڵای تەمەن وەری جارێکی تر پەلکان نادا، لە کاتێکدا لە هەموو دەرە بەهارێکی نوێ گەڵای تازە دەڕوێ، تۆ هەر لەو**

گەڵایانە بڕوانە وا بەری ئاسمانێیان گرتوە، واز لەوانە بێنە وەریوون و لەسەر زەویین، مەبە بەشێك لەوان.

ئەگەر دوێنێت ڕۆیی، خۆ ئەمڕۆت لەبەردەستە ئەگەر ئەمرۆش بەر و بارگەی پێچایەوە و لەسەر ڕۆیشتنێ بوو ئەوەتا بەیانیت هەیە، غەمباری دوێنێ مەبە چونکە نایێتەوە، بۆ ئەمڕۆش داخان مەخۆ چونکە دەڕوا. خەون بە ڕۆژێکی پڕشنگدارەوە ببینە کە سبەی هەڵدێ.

درەوشانەوە: ئەستەمە بتوانی ئەو هەموو نەخۆشییانە بهێنیتە پێش چاوی خۆت کە لە ئەنجامی قسەی ناخۆش و دەمەقڕێ دروست بوون!

ناوبڕ: ماڵەکەی خۆت بکە میحرابی زیکر و کۆشکێك لە زانست.

**بریسكە: ئافرەتان خوشكی پیاوانن.**

## مەرجانی نۆیەم: خودای لە شێنەیی بناسە ئەویش لە تەنگانە دەتناسێ

ئەی بێ هیوا پێش مەرگت بـمــرە ئەگەر
دەشتەوێ بژی دەبێت ئومێدێكت هەبێ

**كاتێك پێغەمبەر یونس(علیه السلام) لە نێو سكی نەهەنگ هەستی بە دڵگوشران كرد، لە نێو ئەو تاریكییە ئەنگوستەچاوە: تاریكی دەریا، تاریكی نێو سكی نەهەنگ و تاریكی شەو، دڵی گیرا. غەم و خەفەتی زۆر بوو، وەڕەز بوو، هاواری بۆ خودای فریادڕەسی لێقەوماوان، پەناگیری كەسەرداران، بۆ خودای بەڕەحم وبەخشندە برد، زمانی بەو پەیڤانە پڕا كە هەر دەڵێی یاقووت و مەرجانن:[ وَذَا النُّون إِذْ ذَهَبَ مُغَاضِبًا فَظَنَّ أَنْ لَنْ نَقْدِرَ عَلَيْه فَنَادَى فِي الظُّلُمَاتِ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ] (الأنبياء :٨٧)**

**واتە: (باسی) زەننون (یونس بكە كە پێغەمبەری خەڵكی نەینەوا بوو) كاتێ بە توڕەیی ڕۆیشت (گەلەكەی بەجێ هێشت) وای دەزانی ئێمە تەنگانەی بەسەردا ناهێنین، جا لە تاریكیەكاندا (تاریكی شەو و دەریا و ناوسكی نەهەنگ) هاواری كرد (ئەی خودا) بەڕاستی هیچ پەرستراوێك نی یە جگە لە تۆ، پاكی و**

بێگەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم). هەر زوو باوەگۆیی دراوە، خودا دەفەرمووێ:[ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَٰلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ] (الأنبياء :٨٨)

واتە: (ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیراکرد و لەو غەم و خەفەتە ڕزگارمان کرد هەرواش ئیماندارا ن ڕزگار دەکەین.

خودا سروشی بۆ نەهەنگەکە نارد، کە یونس لە وشکانییەك هەڵبداتە دەرێ، بە نەخۆشی و لاوازی خۆی لە کەنارێك دیتەوە، بەڵام لەژێر چاودێری خودای دا بوو، خودا بە ڕەحمەتی خۆی دایپۆشی، بنەکولەکەیەکی بۆ شین کرد ـ کولەکە قەدی نییە تەنیا پەلك و گەڵای پانی هەیە ـ خودا وەکو جارانی لێ کردەوە، بوژایەوە و کەوتەوە سەرخۆی. ئەم ڕووداوە بۆ ئەو کەسانەیە کە خودای لە فەرەحنایی دەناسن، خوداش ئەوان لە ڕۆژەڕەشە دەناسێتەوە و فەرامۆشییان ناکا.

درەوشانەوە: تاکو نەتوانی ڕێبەری ژیانی خۆت بکەی، ناتوانی خۆت بەڕێوە ببەی.

ناوبڕ: بە گوناهی خۆت خەریك بە و واز لە هی دراوسێیەکەت بێنە.

**بریسکە: پیاو بێ ژن هەژار دەبێ**

## مەرجانی دەیەم: ئافرەتێکی خاوەن زۆرترین مارەیی لە جیهاندا

لە شنەی شەماڵ نەرمتر بە کە هەڵ دەکا
لە کەلـــوی ئەستێرانیش ســـەربڵندتر بە

**ئەبو تەڵحە داوای لە ئوم سەلیمی کچی مەلحان کرد شووی پێ بکا، ئەبو تەڵحە ئامادە بوو مارەییەکی زۆر بدا، وەلێ کاتێك ئوم سەلیم بە فیز و سەربڵندییەوە داخوازییەکەی ڕەفز کردەوە، ئەبو تەڵحە هێدم گرتی. ئوم سەلیم گوتی: ناکرێ و نابێ شوو بە خودانەناسێك بکەم، ئەرێ ئەبو تەڵحە خۆ دەزانی ئەو بتانەی ئێوە لەلایەن فلانە بنەماڵەوە دەنەخشێندرێ و ئەگەر ئێوە ئاگریان تێبەردەن دەسووتێن؟!**

**ئەبو تەڵحە دڵی گیرا و ڕۆیی تا ئەو ساتەش نەیدەتوانی بڕوا بەوە بکا کە بینی و ژنەوتی، بەڵام ئەوینی ڕاست وای لێ کرد ڕۆژی دواتر دیسان بگەڕێتەوە. سەبارەتێ بەوەی ئوم سەلیم ڕازی بێ، مارەییەکی زۆرتر و ژیانێکی خۆشتری پێشنیار کرد. ئوم سەلیم بە ڕێزێکی زۆرەوە گوتی: ئەی ئەبو تەڵحە پیاوێکی وەکو ئێوەمانان ڕەد ناکرێتەوە، بەڵام دەستی ئەوەم شکاوە تۆ بابایەکی بێباوەڕی و منیش ئافرەتێکی موسڵمانم، ناگونجێ شووت پێ بکەم. ئەبو تەڵحە**

گوتی: زەرد و سپییت (زێڕ و زیوت) دەدەمێ. ئوم سەلیم گوتی: من زەرەد و سپییم ناوێ نا، ئیسلامەتییم لێت دەوێ، ئەبو تەڵحە گوتی: بۆ ئیسلامەتی قسە لەگەڵ کێ بکەم، گوتی: پێغەمبەری خوداﷺ، ئەبو تەڵحە ڕۆیی و چوو پێغەمبەرﷺ ببینێ، کە لە نێو کۆمەڵی یاران دانیشتبوو، هەر کە پێغەمبەرﷺ ئەبو تەڵحەی بینی، فەرمووی: ((جاءكم ابو طلحة غرة الاسلام في عينيه)). ئەبو تەڵحە دێتە لامان و نووری ئیسلام لەنێو چاوانیەتی. هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و هەموو سەربردەی خۆی لەگەڵ ئوم سەلیم گێڕایەوە، پێغەمبەرﷺ لە یەکدی مارەکردن.

ئەم ئافرەتە نمونەیەکی بەرزە بۆ ئەوانەی حەز بە پلە و پاداشت دەکەن. بڕوانە چۆن بەو ڕەوشتە جوانەی دێری ئیمان و ماقووڵیی تۆمار کرد، چاو لەو پاداشتەی بکە کە لای خودای تاك و تەنیا هەیەتی، بڕوانە چ پێداهەڵگوتنێکی شیرین و بۆن خۆشی جێهێشتووە. پاداشتێکی چەند بە خێر و بەرەکەتی بەدەست هێنا. ئەوەشی سەبارەت بەو ڕاستگۆییەی بوو لە خودای خۆی و ڕاستیی لەگەڵ خودی خۆی و ڕاستی لەگەڵ خەڵك، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستبێژیەکەیان بەکەڵك دێ، بەهەشتی نەمرییان لێ پیرۆز بێ، تا هەتایە بەخۆشی لێی بمێننەوە چونکە ئەوانە لە براوەکانن.

درەوشانەوە: ئەگەر دەتەوێ بزەی ئەوانی دی ببینی دەبێت بەخۆشت پێبکەنی.

ناوبڕ: ئەگەر توڕە بووی کڕ بە، چونکە کەسی توڕە سەرخۆشە.

ئەگەر ئافرەت لە تۆقی سەری هەتا بنی پێی هەمووی بە ئەڵماس دابپۆشێ، سوودی نییە، تاوەکو بەرگی خۆپارێزی و خوداناسی نەپۆشێ. ئارایش ناتوانێ ڕۆحێکی بێزەوەر جوان بکا، هەوەسێکی کرێت برازێنێتەوە، هیمەتێکی سووك بەرز بکا. پێداگری لەسەر جوانکاری ئایینداری و خۆپارێزی و گران و سەنگینی بکە، ئەم شتانە لە ئارایش و جوانکاری دونیا بەهادارترن.

**بریسکە: لەسەر هەر بەڵا و ناخۆشییەك ئارامت هەبێ.**

## ئەڵماسی یەکەم: کلیلەکانی سەرکەوتن

ئەو دونیایە ماڵێکە ئەوەی ئەمڕۆ لێی پێبکەنێ
دڵنیابن سبەی دەگری، ئای لەو ماڵە ناخۆشەی

**ـ کلیلی سەربەرزی: ملکەچی خودا و پێغەمبەرە ﷺ.**
**ـ کلیلی ڕۆزی: هەوڵدانە بۆ ئیستیغفار و خۆپارێزی.**
**ـ کلیلی بەهەشت: یەکتاپەرستییە.**
**ـ کلیلی باوەڕ: ڕامانە لە نیشانەکانی خودا و دروستکراوەکانی.**
**ـ کلیلی چاکە: بەخشینە.**
**ـ کلیلی ژیانی دڵ: هزرینە لە قورئان و دوعاکردنە لەبەرەبەیانی و وازهێنانە لە گوناە.**
**ـ کلیلی زانست: پرسیاری جوان و باش گوێدانە.**
**ـ کلیلی سەرکەوتن: ئارامگرتنە.**
**ـ کلیلی بردنەوە و پێشکەوتن: خۆپارێزییە.**
**ـ کلیلی زیادبوون: سوپاسگوزارییە.**
**ـ کلیلی خوازیاربوونی ڕۆژی دوایی: دونیانەویستیە.**
**ـ کلیلی بەرسڤ: پاڕانەوەیە.**

**درەوشانەوە: زەردەخەنە تیشکێکە لە شەبەنگی خۆر.**

**ناوبڕ: لە شتی پڕو پوچ کڕ بە تا بەسەر خۆتدا نەشکێیتەوە.**

بریسکە: پەروەردگارا.. دوای ئەوەی کە هیدایەت و ڕێنموویيت کردین، دڵەکانمان لە ڕێگەی ڕاست لامەدە و لە ڕەحمەت و بەخششی تایبەتی خۆت بەهرەوەرمان بکە.

## ئەڵماسی دووەم: دوای ئاریشە و ناخۆشی تام و چێژی سەرکەوتن دێ

غەم شتێك نییە بتوانێ جێگیر بێ، بۆیە مەیهێڵە.
غـــەمـــەكانت نـــــــــاتـــوانن بـمـێـننـەوە

دوای مانگی هەنگوینی ئافرەتێك نامەی بۆ دایكی نووسیووە و دەڵێ: دایە، ئەمڕۆ دوای بەسەربردنی مانگی هەنگوینی گەڕامەوە ماڵێ خۆمان، گەڕامەوە ئەو لانە بچكۆڵەی كە پیاوەكەم دابینی كردووە.

دایەگیان ئاواتەخواز بووم لێم نزیك بای، تا هەموو ئەزموونی ئەم ژیانە نوێیەی خۆمتم لەگەڵ هاوسەرەكەم بۆ گێڕابایەوە. هاوسەرەكەم پیاوێكی چاكە و خۆشی دەوێم، منیش ئەوم خۆشدەوێ، بۆ ڕازیكردنی ئەو، ئەوەی لە توانامدا بێت دەیكەم... هۆ دایە گیان دڵنیابە هەموو ئامۆژگارییەكانی تۆم پاراستووە و كار بە هەموو پەندەكانی تۆ دەكەم. كە لە شەوی گواستنەوە لە باوەشت گرتم و بە سینگی خۆتتەوە ڕاتگوشیم تا ئێستەشی لەگەڵ بێ، هەموو وشەكانت هەموو پیتێكی كە تۆ گوتوتە و، چرپاندووتە بە گوێمدا، لەبیرە.

من لە گۆشەنیگای تۆ لە ژیان دەڕوانم.. تۆ نموونەی پێشەنگێکی باڵای.. هیچ ئامانجێکم نییە هێ لەوەی بتوانم ئەو شتانە بکەم کە تۆ لەگەڵ باوکم کردووتە، تۆ ئەو هەموو سۆز و خۆشەویستییەی خۆتت بە ئێمە بەخشی.. مانای ژیانت فێرکردین و پێت گوتین چۆن بژیین.. بەدەستی خۆت تۆوی ئەڤینت لە دڵدا چاندین.

وا گوێم لە کلیلەکەیە لەنێو کیلۆینی دەرگاکە سرتەی دێ پێم چالاوایە هاوسەرەکەم دەیەوێ ئەم نامەیەم بخوێنێتەوە، دەیەوێ بزانێ چی بۆ دایکم دەنووسم، دەیەوێ لەو ساتە خۆشەدا بەشدار بێ کە من بە ڕۆح و بیر لەگەڵ تۆی دەگوزەرێنم. هاوسەرەکەم داوای لێ کردم قەڵەمەکە و هەندێ لە نامەکە بە بۆشی جێبێڵم، تا ئەویش شتێك بنووسێ. دایە تۆ و باوکم و خوشك و براکانم ماچ دەکەم، ئیدی بەهیوای دیدار.

درەوشانەوە: زەردەخەنە چی تێناچێ بەڵام بەخشینێکی زۆرە.

ناوبڕ: دانیشتن لەگەڵ بێئیشان کوشتنی کاتە بەنرخەکانە.

بریسکە: پەروەردگارا ئەم کارەمان لێ وەربگرەو لە ڕیزی چاکەکانماندا تۆماری بکە، چونکە بەڕاستی تۆ خودایەکی زۆر بیسەرو زانایت.

## ئەڵماسی سێیەم: دوودڵی هزر و جەستە ئازار دەدا

گـــــتی: ژیـــــان نائومێدی و غەمە
گوتم: بەس پێبکەنە غەم بە با دەچێ

یەکێك لە ئەدگارە خراپەکانی دوودڵی ئەوەیە هێزی تەرکیزی هزر وێران دەکا، کە ڕاڕا دەبین هزرمان پەرت و بڵاو دەبێت، ئەگەر زۆری لەخۆمان بکەین و خۆمان بۆ خراپترین ئەگەر ئامادە بکەین، بەو شتە خۆمان لەنێو حاڵەتێك دابنێین هاوکارمان بێت، زەینمان تەرکیزی هەبێ لەناو جەرگەی کێشەکەدا ناتوانین بۆ کارێکی وروژێنەر بە پەرۆش بین و لەهەمان کاتیش هەست بە دڵەڕاوکێ بکەین. یەکێك لەو هەستانە ئەوی دیکە هەڵدەداتە دەرێ، کاتێك لە بارەی شتێکی هەنووکەیی هەستت بە دڵەڕاوکێ کرد، بە لاپەڕەکانی یادگاریتدا بڕۆوە تا دەگەیتە خراپترین حاڵەت لە حاڵەتەکانی دڵەڕاوکێ کە پێشتر توشی بووی. بەم جۆرە عەقڵ دوو بژاری جیاواز لەیەکی دێتە بەردەم، ئەو بژارەی باشتر و بەهێزترە کە لە ڕابردودا ڕویداوە بەسەر ئەوەی ئێستا کە کەمتر سەخت و زەحمەتە زاڵ دەبێ،

ئەوکات کەسەکە دەڵێ: چی لەو حاڵەتەی پێشوم سەختتر و ناخۆشتر نەهاتووەتە ڕێم! کەچی بەسەرکەوتوویی تێمپەڕاندووە، تۆیەك کە توانیبێتت قەیران و ئاریشەی وا بەسەلامەتی تێپەڕێنی ئەوەی ئەمڕۆ هێندە سەخت و تاقەتپڕوکێن نییە بۆیە دەڕوا.

دڵەڕاوکێ لەکاتی بێ ئیشی و تەنبەڵی بەسەرتدا زاڵ دەبێ، ئەوکات خەیاڵ جەمەو بیر لەهەموو ئەگەرێك دەکەیتەوە، بۆیە چارەسەر ئەوەیە بە کارێکی باش و شیاو خۆت خەریك بکەی.

درەوشانەوە: دەشێ شتی پڕوپوچ وا لە کەسی ژیر و هۆشمەند بکات بەرەو لێواری شێتی بچێ.

ناوبڕ: دەرگەی هیوا بکەوە و ڕێی ئیش بگرەبەر.

**بریسکە: ژیان خولەك و چرکەیە.**

## ئەڵماسی چوارەم: ئیش و کاری بەدڵی خۆت ڕازی بەختەوەرییە

ئـــــارام لەســــەر تەنگانەی ڕۆژگار بگرە چـــونکە داهاتوویێك هەیە، بەڕاستی ئارام گرتن خۆڕاگری دەوێ

**کەسی بلیمەت لە هەر بوارێکدا بێت هەموو هەوڵ و کۆششی خۆی لەم بوارەدا کە بۆی دروست کردووە و ڕێی پێدراوە داهێنانی تێدا بکا، دەخاتە گەڕ، تاوەك ئەگەر گلەییش لە بەدبەختی خۆی لەم بوارەدا بکا هێشتا هەر ئەم کارە تاکە شتە ئەو کەسە دەتوانێ بە چێژ و ئەزموونەوە بیکا، سەرەڕای ئەو سەختی و ناخۆشیانە، کەسی بلیمەت گوێ ناداتێ، تەنانەت ئەگەر هیوای بەم کارەش کەم و لاواز بێ، با زۆریش ئاوڕ بۆ دواوەی بداتەوە و خۆزگە بخوازێ ئیشێکی تری کردبا کە داهاتی زیاتر و پارەی زیاتری دەست کەوتبا، با زۆریش گازاندە لە هەژاری خۆی بکا و کە بەهۆی ئەم پیشەیەوە دووچاری بووە، هەموو ئەو شتانە ناکاتە ئەو بەختەوەریی و خێر و بێرەی بەدەستی دێنێ.**

**درەوشانەوە: بەختەوەری پیاو لە پەیڤێك دایە وا لەنێو لێوانی ئافرەتدا دەگوترێ.**

**ناوبڕ: بە درێژایی مێژوو چەند ئافرەتی جوان هاتن و ڕۆیشتن؟.. جوانی کۆتایی هات و کردەوە مایەوە!**

**بریسکە: کاتێ نەخۆش دەکەوم هەر ئەوە شیفام بۆ دەنێرێ**

## ئەڵماسی پێنجەم: هێز لە دڵدایە نەك لە جەستە

لە ڕۆژگاری ژیانم خووێکم هەیە ئەگەر ڕۆژێك تەنگ بوو
ئارام دەگرم
ئەگــــەر خۆش بـــوو، بە دڵم بوو سوپاسی خودای
لەسەر دەکەم

**ژنە دیانێك لە ژیانی خۆی جگە لە هەژاری و برسیەتی و نەخۆشی چیدی نەدیبوو، بە ماوەیەکی کورت دوای هاوسەرگیری پیاوەکەی مرد و، مێردی دووەمیشی ژنێکی هەڵگرت و هەڵات، پاشان کابرایان بە مردوویی لە کاولێك دیتەوە. ئەم ژنە یەك تاقە کوڕی هەبوو... ژنە لەبەر دەستکورتی و نەخۆشی هەندێ جار فکری بۆ ئەوە دەچوو دەست لەو کوڕە چوارساڵیەش بەردا.**

**خاڵی وەرچەرخان لە ژیانی ئەم ژنە ئەوکاتە دەستی پێکرد کە ڕۆژێکیان بە کۆڵانەکانی شاردا دەڕۆی، لەسەر زەوییەکی شەختە قاچی خلیسکا، ماوەیەکی زۆر بێ هۆش کەوت، بەهۆی ئەو بەربونەوەیە زیانێکی زۆر بە بڕبڕەی پشتی گەیشت، دکتۆرەکان دوو پێشبینیان بۆ کرد، گوتیان: یان بەزوویی دەمرێ یان ئەوەندەی ژیانی ماوە بەتەواوی پەکی دەکەوێ (ئیفلیج). لەوکاتەی ژنە لەنێو جێ و بالینگانی خۆی ڕاکشابوو، ئینجیلی پیرۆزی کردەوە، بە**

هاوکاری خودای گەیشتە ئەو پەیڤانەی ئینجیلی مەتا: ((کەسانی پەککەوتەیان لەنێو جێی دەهێنایە خزمەت حەزرەتی عیسا (سەلامی خودای لێ بێ) ئەوکاتی عیسا بەپەککەوتەکەی دەفورموو: هەستە و جێ و بالینگانت بپێچەوە و بڕۆوە ماڵێ، کەسەکە هەڵدەستا و بەپێی خۆی دەڕۆیشتەوە)).

ئەو پەیڤانە ئیمانی ژنەی جوڵاند و بڕوای پتەوتر کرد، بەجۆرێ لەجێی خۆی هەستا!! لە ژورەکەیدا دەستی بە گەڕان کرد. ئەو ئەزمونە ڕێگای تایبەتی ئەو ئافرەتە پەککەوتەیەیە بۆ چارەسەرکردنی خۆی و لەشساغی خەڵکی دیش دیل کارینگی دەڵێت: ئەو ئەزمونە وای لە (ماری بەیکەر ئیدی) کرد ببێتە موژدەدەری ئاینێکی نوێ پێدەچی ئەم ئاینە تاکە ئاین بێ کە ئافرەتێك موژدەدەریەتی. ئەی تۆ خوشکە موسڵمانەکەم چی دەکەی؟!

درەوشانەوە: بەهێزترین قەڵا ئافرەتی چاکە.

ناوبڕ: ئەی ئەو کەسەی وا لە نێو کۆشك و تەلار دای هەژاری نێو کاولانت لەبیر بێ.

بریسکە: قەناعەت گەنجێکە نافەوتێ

## ئەڵماسی شەشەم: ئافرەتی سەلار جەهەنەمی ناخۆش و دەرد دەکاتە بەهەشت

ئاکامــی ئارامگرتنی جوان هەر جوانیی دەبێ
باشترین ڕەوشتی پاڵەوانان چاکە و میهرەبانییە

**هاوەڵی بەڕێز خاتوو ئوم سولەیمی خێزانی ئەبو تەڵحە (خودا لێیان ڕازی بێ) نمونەیەکی زۆر جوانمان لەبارەی ئارامگرتن لەسەر سك سوتان بۆ دەگێڕێتەوە کە چۆن خودا لە بڕی ئەوە خێر و بێری پێدا. لە ئەنەسەوە (ر.خ) دەڵێت: ئەبی تەڵحە (ر.خ) کوڕێکی هەبوو نەخۆش بوو، ئەبو تەڵحە ڕۆیشت، دواتر منداڵەکە مرد. وەختێك ئەبو تەڵحە گەڕایەوە، گوتی: ئەرێ کوڕەکەم چۆنە؟ ئوم سولەیم کە دایکی کۆرپەکە بوو، گوتی: ئێستا باشترە! ئوم سەلیمە نانی ئێوارەی هێنا و خواردیان و ڕاکشان. پاشان ئوم سولەیم بە ئەبی تەڵحەی گوت: پیاوەکە، کوڕەکەمان بشارەوە، ڕۆژی دواترێ ئەبو تەڵحە چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سەربردەکەی بۆ گێڕایەوە، خۆشەویست ﷺ پێی فەرموو: سەرجێیتان کرد؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: خودا بەرەکەت بڕژێنێ. ئوم سەلیمە کوڕێکی بوو، ئەنەس دەڵێت: ئەبو تەڵحە پێی وتم:**

بیبە خزمەت پێغەمبەرﷺ و چەند دەنکە خورمایەکیش ببە. ئەنەس دەڵێ: بردم و خۆشەویستﷺ فەرمووی: هیچتان لەگەڵ نەهێناوە؟ گوتم: بەڵێ، خورما، پێغەمبەر ﷺ هێندێکی لێ هەڵگرت و تەڕی کرد و لە زاری منداڵەکەی نا و ناوی نا: عەبدوڵا.

درەوشانەوە: هیچ شتێ وەکو داوێن پاکی پلە و ڕێزی ئافرەت زیاد ناکات.

ناوبڕ: نائومێد مەبە خودا هاواری لێ دەکرێ..مەترسێ خودا ڕجای لێ دەکرێ.

**بریسکە: موژدەی شەوێ بدەن گەردی بەیانی دادێ.**

## ئەڵماسی حەوتەم: ئارام بگرە تا سەرکەوتوو بیت

لەسەر خۆشی و ناخۆشی زەمانە ئارام بگرن چونکە
ئەوەی خووی بە ئارامییەوە گرت بێ بەرەو پێگەیشتن دەچێ

**لە فەرموودەدا هاتووە ئوم ڕەبیعی کچی بەڕا کە دەکاتە دایکی حاریسەی کوڕی سوراقە، لە شەڕی بەدر شەهید بوو، هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و تکای لە پێغەمبەرﷺ کرد گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ حاریسە چی بەسەرهات؟ ئەگەر چووەتە بەهەشتێ با ئارام بگرم، بەڵام ئەگەر وا نییە با گەرمە شینێك بگێڕم، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: ((یا ام حارثة، انها جنان فی الجنة، و ان ابنك اصاب الفردوس الاعلی)). واتە: ئەی دایکی حاریسە، کوڕەکەت لەنێو بەهەشتە، کوڕەکەت گەیشتوەتە فیردەوسی باڵا.**

**بەڕاستی لەدەست دانی کوڕ دڵ هەلا هەلا دەکات، جەرگ دەسوتێنی و هەناو دادەڕزێنێ، کەچی ئەو ئافرەتە هاتووە لە پێغەمبەرﷺ دەپرسی ئەگەر کوڕەکەم لە بەهەشتە پێی دەگەمەوە و لە پێناوی پلە بەرزی و پایەی ئەو لە بەهەشتدا ئارام دەگرم، ئەگەر بەم جۆرەش نییە، ئەوەندە بەکوڵ دەگریم وەکو ئەوانەی تا**

**هەتایە بۆ دۆستێکی ئازیز دەگرین، ئاخەر هەر ئەوەم لە دەست دێ .**
**ئەو ئافرەتە کۆستکەوتووە چەند میهرەبان و بەسۆزە! چەند ئارامگر و خوداناس و خۆڕاگرە.**

**درەوشانەوە: ئەگەر ژنی جوان گەوهەر بێ.. ژنی بەڕێز و باش گەنجینەیە.**

**ناوبڕ: هەموو ڕۆژێ فەرموودەیەکی خۆشەویستﷺ لە (ریاض الصالحین) بۆ ماڵ و منداڵت بخوێنەوە.**

**بریسکە: ئافرەت خۆرە، وەلێ ئاوا نابێ**

## ئەڵماسی هەشتەم: لە قەیراندا هێ لە خودای چ پەناگیرمان نییە

خـــــــۆزگە تۆ شـــــــیرین بـــــای، با ژیان تاڵ با
خۆزگە تۆم لێ ڕازی با، با هەموو خەڵك لێم تووڕە بێ

**ئەگەر غەمت بۆ پەیدا بوو، خەفەت دەورەی دای، پەست و بێزار بووی و دونیات لێ تەنگ و تاریك بوو، هەموو ڕێیەکانت لێ داخرا، هاوار کە و بڵێ: یا الله ..یا الله: (( لا اله الا الله العظیم الحلیم، لا اله الا الله رب العرش العظیم، لا اله الا رب السموات و رب الارض و رب العرش الکریم)). غەم و خەفەتت دەڕەوێتەوە و دەرووی خێرت لێ دەکرێتەوە و ڕەحمەتت لە کۆڵ دەبێتەوە: [ فَاسْتَجَبْنَا لَهُ وَنَجَّيْنَاهُ مِنَ الْغَمِّ وَكَذَلِكَ نُنْجِي الْمُؤْمِنِينَ (الأنبياء :٨٨)]**

**واتە: (ئێمەش نزاو هاواری ئەومان گیراکرد و لەو غەم و خەفەتە ڕزگارمان کرد هەرواش ئیماندارا ڕزگار دەکەین.)**

**[وَمَا بِكُمْ مِنْ نِعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ] (النحل :٥٣)**

واتە: هەر چاکە و بەهرەیەکتان هەبێ ئەوە هەمووی لە خوداوەیە پاشان کاتێ دووچاری زیان و ناڕەحەتیەك ببن ئەوە پەناو هاوار هەر بۆ لای ئەو دەبەن.

ئەگەر نەخۆشی تینی بۆ نەساغێك هێنا و لەش و لاری لاواز بوو، ڕەنگی هەڵبزڕکاو و ڕەنگی نەما، دەوا و دەرمان کەڵکی نەما، دکتۆر دەستەوەستان بوو، دەست و دڵی نەخۆشەکە لە بێ هێزیان دەلەرزین، دڵی دەلەرزی و بنێسا، با نەخۆشەکە دەست لە خۆی بەرنەدا و ڕووبکاتە خودای مەزن و دڵۆڤان و هاوار کە: یا الله .. یاالله، ئیدی نەخۆشی نامێنێ و کابرا چادەبێتەوە و دوعاش باوەگۆی دەدرێتەوە: [ وَأَيُّوبَ إِذْ نَادَى رَبَّهُ أَنِّي مَسَّنِيَ الضُّرُّ وَأَنْتَ أَرْحَمُ الرَّاحِمِينَ. فَاسْتَجَبْنَا لَهُ فَكَشَفْنَا مَا بِهِ مِنْ ضُرٍّ وَآتَيْنَاهُ أَهْلَهُ وَمِثْلَهُمْ مَعَهُمْ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَذِكْرَى لِلْعَابِدِينَ]

واتە: (باسی) ئەیووب (بکە) کاتێ هاواری لە پەروەردگاری کرد (لە دوای ناساغی ماوەیەکی زۆر) بەڕاستی من زیان و ئازار و نەخۆشی دووچارم بووە و تۆش میهرەبانترینی میهرەبانانی. جا ئێمەش هاوارو نزاکەیمان گیرا کرد و لامان برد ئەو زیان و ئازار و نەخۆشییەی هەیبوو و هەموو ماڵ و منداڵیمان پێ بەخشیەوە (کە پێشتر مردبوون) و ئەوەندەی تریش لەگەڵیاندا ئەوە ڕەحمەتێکی تایبەت بوو لە ئێمەوە و بیرخەرەوە و ئامۆژگاری بوو بۆ خوداپەرستان.

درەوشانەوە: باشترین شت کە پیاو لە خۆی بگرێ ئافرەتێکی وەفادارە.

ناوبڕ: نوێژێکی لەخوداترسانە بکە چون ئەوەی چاوەڕێی تۆ دەکا نوێژێك ناهێنێ.

**بریسکە: لەگەڵ شوشەی (ئافرەت) نەرم بن**

## ئەڵماسی نۆیەم: ئەرێ هەر خودا نییە تکای لێقەوماوان وەردەگرێ

لە کێشە و قەیراندا هێندە دەروونت ماندوو مەکە، چ کاتێك قەیرانەکە دژوار بوو چاوەڕێی کۆتایی هاتنی کێشەکە بە

**بەخشندەیی خودا ئاوایە کەس بە دەست بەتاڵی ڕەوان ناکاتەوە، ئەوەی لەبەری بپاڕێتەوە،زایەی ناکات، بەگوێرەی پێویستی مرۆڤەکە و پاڕانەوە و ملکەچی بەندەکە، بەڵێ بەپێی تکای لێقەوماوان، وەردەگرێ و دەرووی خێر دەکاتەوە، هەر لە بەخشندەیی خودای ئەوەیە تکا و پاڕانەوەی ناموسڵمانانیش لە کاتی پێویستی و ناچاری و سەرکزی کەسەکە و متمانە بوون بە میهرەبانی خودا و تەما بوون بە بەخشندەیی گیرا دەکا، خودا بە هاواری وانیش دەچی، ناخۆشییان لەسەر دەبا، بەڵکو خودایان خۆش بوێ و بڕوا بهێنن لێ زۆرینەی خەڵك چاکە لەبیر دەکەن و جوانییەکان نابینن و لەبەرانبەر چاکە بێ ئەمەکن: [فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ] (العنكبوت :٦٥)**

**واتە: ئینجا کاتێ ئەو (بێباوەڕانە) سواری کەشتی دەبن (و ترسان لە نوقم بوون) بەدڵسۆزی و گەردنکەچییەوە هاوار لە خودا**

دەکەن، کەچی کاتێ خودا ڕزگاریان دەکات و دەگەنە وشکانی کتوپڕ ئەوان هاوبەش بۆ خودا دادەنێن.) خودا بەبیر بەندەکانی خۆی دێنێتەوە کە هەر خۆیەتی تکای بێچاران وەردەگرێ و لە تەنگانە ڕزگاریان دەکات، ئەوەش یەکێکە لە بەڵگەکانی خودایەتی خودای تاك و تەنیا دەسەلمێنی وەلێ کەمێك لە خەڵکی دیتەوە بیریان:[أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الْأَرْضِ أَإِلَٰهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلًا مَا تَذَكَّرُونَ] (النمل :٦٢)

واتە: ئایا زاتێ کە دێت بە هاواری ناچارو داماوەوە کاتێ هاواری لێ دەکات و ناخۆشی و بەڵاکان لادەبات و دەتان کاتە جێنشینی گەلانی تری سەر زەوی ئایا پەرستراوێکی تر هەیە لەگەل خودادا (نەخێر نییە) بەڵام زۆر کەم بیردەکەنەوە.

درەوشانەوە: پێویستە ئافرەت لە ماڵەوە بمێنێتەوە چونکە ئافرەت ناسکە.

ناوبڕ: لە قورئاندا هەندێ ئافرەت بەهۆی ڕەفتاری جوانیان نەمرن، هەندێ ئافرەتیش سەبارەت بە خراپی ئاکاریان شەرمەزار کراون.

**بریسکە: نەکەی ئازاری خەڵکی بدەی چونکە بەڵگەی شکست و نسکۆیە**

## ئەڵماسی دەیەم: ئەوەی قرچۆکی دەکا ئەوا ڕژدی لەبارەی خۆیەوە دەکا

وەکو ڕووی ئەســـتێران بە و بدرەوشـــێوە
لە غەمێ مەترسێ ڕووت تێبکا و تارت بکا

**سەرچاوەکان باس لە بەخشندەیی ئوم لبەنینی کچی عەبدولعەزیز خوشکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەکەن کە ئافرەتانی بانگهێشت ماڵێ خۆی کردووە و جلك و بەرگی جوانی پێداون و پارەشی داونەتێ، پێی گوتون: جلك و بەرگەکە بۆ خۆتان و پارەکەش بدەنە هەژارەکان ـ ئوم لبەنین بەم شێوازە ویستوویەتی ئافرەتان فێری بەخشین و نانبەدەیی بکا و لەسەر ئەوە ڕایان بێنێ، هەر لەو دەگێڕنەوە دەیفەرموو: ئۆف! لە دەست ڕەزیلی، بەخودا ئەگەر جلك و بەرگ بدوورێ قۆڵی لێ هەڵناکێشم، ئەگەر ببێتە ڕێگە بەسەریدا نەدەڕۆیشتم.**

**لە وتە جوانەکانی لەبارەی بەخشندەیی: هەرکەس ویست و حەزێکی هەیە، حەزی من تەنیا و تەنیا بەخشین و نانبدەییە، سوێند بەخودا دڵاوایی و هاوکاریکردنم لە خواردنی خۆشی لە کاتی برسیەتی و خواردنەوەی بەفراو لە تێنویەتییدا لا خۆشەویستترە.**

هەر لەبارەی پێداگری ئەو لەسەر بەخشین و پارەدان بەکەسی شیاو و دەستگیرۆی کەسانی دی، دەفەرمووێ: هەرگیز ئیرەییم بە کەس نەبردووە تەنیا بە کەسێك نەبێ چاکە و خێری هەبێ، حەزم لێ بووە لەو خێرەی بەشدار بم.

ئا ئەمە ئوم لبەنینە، ئەو وتار و کردارەی ئەوە، کوان ئەوانەی بە ئوم لبەنین دەچن!؟

درەوشانەوە: بە مردنی خۆپەرستی، بەختەوەریی سەر ڕێژ دەبێ.

ناوبڕ: هەموو ڕۆژێ چارێکە سەعاتێك بیر لە داهاتوو و دوارِۆژ بکەوە.

دونیای هیچ و پوچ ئاوایە، لە بازاڕی ئەم سەردەمی زێدەڕەویی و ڕابواردن و زێدەئیسراڤییەیدا کەنیزەك دەکڕدرێن، هەر یەکێکییان هێندەی شاخێك زێڕو زیویان پێوە دەکرێ، کەچی هاوەڵە خاتوونەکانی پێغەمبەر ﷺ لە ژوورێکی بە خشت و قوڕ لەسەر حەسیرێکی لە لکی دارخورما دەژیان، هەر ئاو و خورمایان هەبوو. داخ لە دەست ئەو دونیایەی کە ڕێز لە بەها باڵاکان ناگرێ و نەفسیش جوداکاری لە نێوان ڕاست و ناڕاست ناکات.

بریسکە: بەڕاستی تەنیا دان بەخۆگران پاداشتی بێ ئەژماریان دەدرێتەوە

## زێوەری یەکەم: تۆ ئافرەتێکی مسوڵمانی و نە ڕۆژهەڵاتی و نە ڕۆژئاوایی

خـــــۆ لەوانـــــــەیە فەڕەحنایـــــی بـــێ لەوانەیە بتوانین لەبەر سێبەری داری بریایی دانیشیین

**ئەمە ئامۆژگاری ئافرەتێکی مسوڵمانی ئەڵمانییە:**

**با لەلایەن ڕۆژئاواوە بەناوی فکر و مۆدێلەوە فێڵتان لێ نەکرێ، ئەم شتانە هەموو تەڵەکەن تا قۆناغ قۆناغ لە ئاینەکەمان دوربکەوینەوە و دەست بەسەر سەر و ماڵمان دابگرن.**

**ئیسلام و شیرازە خێزانییەکەی بۆ ئافرەت گونجاون، چونکە هەر بە سروشتی ئافرەت واباشە لەماڵ بمێنێتەوە، لەوانەیە بپرسن بۆچی؟ چونکە خودا لەڕوی جەستەوە پیاوی لە ئافرەت بەهێزتر دروست کردووە، هەروەها ئافرەتی میهرەبانتر دروست کردووە، کەوابێ ئافرەت شنگی پیاوی نییە، بۆیە ماڵ بۆ ئافرەت پەناگەیەکی باشە، ئەو ئافرەتەی هاوسەر و منداڵەکانی خۆی خۆش دەوێ، بێ هۆ ماڵ جێناهێڵێ و تێکەڵی پیاوان نابێت.**

لە ٩٩٪ ئافرەتانی ڕۆژئاوا تا خۆیان نەفرۆشتبوو نەگەیشتبوونە ئەمڕۆ، کە هیچ ترسێکی خودایان لە دڵدا نییە.

چوونەدەرەوەی ئافرەت لە دونیای ڕۆژئاوا بەم شێوە چڕ و پڕە پیاوانی ناچارکرد ڕۆڵی ئافرەتان بگێڕن، لەماڵێ دانیشن و قاپ و قاچاغ بشۆن و منداڵان ژیرکەنەوە و ئارەقی بخۆنەوە. خۆ ئێمەش دەزانین ئیسلام هیچ بەربەستێکی بۆ ئەوە نییە پیاو یارمەتی خێزانی خۆی لەماڵەوە بدا، بەڵکو هانمان دەدات بەڵام نەك بەم شێوەی ئێستا کە ڕۆڵی هەریەکیان پێچەوانە بێتەوە.

درەوشانەوە: جوان بە، دونیای جوان دەبینی

ناوبڕ: خۆشی لەو کەسەی چاو دادەخا و نامووسی خۆی دەپارێزێ.

**بریسکە: هەموو کارێکی لەبارت بۆ ئاسان دەکەین**

## زێوەری دووەم: غەمەکانت لەبیر کەو بە قوڵی ئیش بکە

پشتمـــــان بە خودای میهرەبان بەستووە
بەڕاستی ئەوەی ئەو پشتیوانی بێ براوەیە

**ئەگەر هەڵسای بە چارەسەرکردنی هەر کێشەیەك، خۆت بە ویستێك یان خوێندنەوە یان ئیشێك خەریك بکە، چونکە سەرقاڵی جێی دوودڵی دەگرێتەوە. خودا لە سینەی هیچ کەسێ دوودڵی دانەناوە، ئێستا وا دابنێ کێشەی تۆ نەخۆشی منداڵەکەتە، دایك و باوك ئەوەی لەدەستیان بێ بۆ چارەسەری دەیکەن، پاشان دەبێ کاتی خۆیان بە شتێکی باش و بەسوود بەسەر ببەن، وا باشە کاتێ مرۆڤ لەنێو گەرداوی کێشەیەك دایە، کێشە و ئاریشە سەختەکانی پێشوو بەبیر خۆی بێنێتەوە، بەتایبەتی ئەو کێشە گەورانەی کە لەو کێشەی ئێستا مەترسیدارترە، سەیر بکا چۆن خودا سەری خست و چارەسەری کرد، بەجۆرێك کاریگەری لەسەر ئێستا نەماوە، تەنیا بۆ خەندە و هەستی متمانەبەخۆبوون نەبێت، ئەگەر مرۆڤ وا بیری کردەوە هەست دەکا کێشەی ئەمڕۆی وەکو ئەوانی بەرێ دێن و دەڕۆن و دەبنە ڕابردوو. مرۆڤ دەبێ بەدوای چارەسەری ئەرێییانە بۆ کێشەکەی بگەڕێ، ئیبن جەوزی**

وتەیەکی بەسوودی هەیە، دەڵێـت: ((ئەوەی بەڵایەکی توشبوو، با لەو بەڵایەی گەورەتر بێنێتە پێش چاوی، لەسەری سوك دەبێ، با بیر لە پاداشتەکەی بکاتەوە وا مەزەندە بکا بەڵای گەورەتری بۆ بێ و وابزانێ ئەوە ڕەحمەتی خودایە کە بەڵای گەورەتری بۆ نەهاتووە، هیوا بخوازێ کە ئەو بەڵایە زوو بڕوا، ئەگەر بەڵای سەخت نەبێ، ئومێدی کاتی خۆشی و فەرحانی نەدەبوو)).

درەوشانەوە: یەکێ لە فرەزانان دەڵێ: هەرگیز پەشیمان نەبویمەوە لەوەی قسەم نەکردووە، بەڵام زۆرجار لەسەر قسەکردن پەشیمان بوومەتەوە.

ناوبڕ: هیچ عەیب نییە هەڵە بکەی و تۆبە بکەی، عەیب ئەوەیە لەسەر هەڵە بەردەوام بی.

**بریسکە: پەروەردگارا.. دوای ئەوەی کە هیدایەت داین و ڕێنموویيت کردین، دڵەکانمان لە ڕێگەی ڕاست لامەدە.**

## زێوەری سێیەم: ئەو خاڵانەی یارمەتیت دەدەن بۆ بەختەوەری

ئەگەر لەلایەن کەسێکی کەم و کورت بە خراپ باسم کرا ئەوە نیشـــــانەی ئەوەیە من کەسێکی بـاش و تەواوم

**چاوچنۆکی و چڵێسی لەناوبەرن، چارەسەریان لەم دەرمانە ئاوێتەی خوارەوەیە:**

**١. خەرجکردن بەشێوەیەکی دیاریکراو و بگر، ئەوەی گوێ بەسەرفکردنێ نەدا هەرگیز قەناعەتی بۆ دروست نابێ، بەڵکو تووشی چاوبرسیەتی دەبێ، کابانی لە سەرفکردن ڕەگ و بنەمای قەناعەتە. وتەیەك هەیە دەڵێت: جوان بەڕێوەبردن نیووەی سەر و سامانە.**

**٢. ئەوەندە بۆ داهاتوو دوو دڵ مەبە، بۆ ئەو مەبەستەش گوریس لەبن زەوی ڕامەخە و ئیمانت هەبێ ئەو ڕۆزییەی بۆت داندراوە هەر دێت.**

**٣. خۆپارێزی و لەخوداترسان، خودا دەفەرمووێ:[ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا(٢) وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا] (الطلاق**

:٣) واتە: هەر کەسێ خوداناس بێ خودا دەروی لێ دەکاتەوە و ڕزق و ڕۆزی دەدات لە لایەکەوە کە بە خەیاڵیدا نەهاتووە و هەر کەسێ پشت بەخوا ببەستێ ئەوە خودای بەسە، بەڕاستی خودا کارو فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێ، بێگومان خودا بە هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە.

٤. زانینی ئەوەی: قەناعەت سەر بەرزت دەکا، چاوبرسیەتی و ویستی زۆر ڕیسوایی لە دوایە، ئیدی پەند لە هەردووکیان وەربگرە.

٥. زۆر لە ژیانی سادە و بەسەرهات و قەناعەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان و ڕابمێنە، بڕوانە ئەو ویستەی ئەوان بۆ چاکە و چاکەخوازی. ئەوان بکە پێشەنگی خۆت.

٦. لە کاروباری دونیای لەوانە بڕوانە لە خوار خۆتن.

درەوشانەوە: کەسی ژیر سوود لە ڕای بەسوود وەردەگرێ، لە هیچ دۆخێك بێ ئومێد نابێ و هەرگیز واز لە بیرکردنەوە و کۆشان ناهێنی.

ناوبڕ: فەرمانی خودای بە گەورە بزانە تا خودا گەورەت بکا، شوێنکەوتووی پێغەمبەرﷺ بە تا شەفاعەتت بۆ بکا.

**بریسکە: بێگومان خودا پشتگیری لەوانە دەکات کە باوەڕییان هێناوە.**

## زێوەری چوارەم: ئەگەر هەموو پەتەکان پچڕان پەتی خۆت بە هومێدی خودای گرێ دە

ئەگەر ماندووبوون نەبوایە هـــەموو خەڵکی دەبووە ئاغا دەستکراوەیی بێ بەها دەبوو، مێرخاسیی کوشندە دەبوو

**پاداشتی کردەوەی چاك بە ئیمانەوە ژیانێکی خۆشە لەسەر زەوی، خۆ مەرج نییە ژیانی خۆش و ڕازاوە تەنیا بە ماڵ و سامان بێ، لەوانەیە ماڵ و سامان ژیان خۆش بکەن لەوانەشە وا نەبێ.**

**لە ژیاندا زۆر شت هەن لە دەوڵەمەندی زیاتر ژیان خۆش دەکەن، بەڵام لە سنووری خۆیاندا هەبن، لەوانە:**

**پێوەندی بە خودا، متمانەبوون پێی و دڵنیا بوون لە چاودێری و ڕەزامەندی ئەو، هەروەها: تەندروستی و هێمنی و ڕەزامەندی و پیت و بەرەکەت و ماڵ و ئەوینی دڵسۆزان،**

**لەوانەش دڵخۆشی بە کردەوەی چاك و جێ پەنجەی کردەوەی باش لەسەر ویژدان و لەسەر ژیانت.**

**پارە و سامان تەنیا بەشێکە، بڕێکی کەم بەستە، تاوەکو دڵ جەخت بکاتە سەر ئەو شتانەی لای خودای نەبڕاوە و پاکتر و گرنگترن.**

درەوشانەوە: یەکێك لە ڕێسا جێگیرەکان دەڵێت: پیاوە مەزنەکان ڕەگەزی مەزنیان لە دایکیانەوە بۆ ماوەتەوە.

ناوبڕ: قورئانێك لە ژوور سەرت دابنێ یەك ئایەتی لێ بخوێنەوە لە دونیا و ئەوەی لەو دونیایەی هەیە باشترە.

بریسکە: لا اله الا الله (هیچ خودایەکی ڕاستی هێ لە ئەڵڵای نییە.)

## زێوەری پێنجەم: کەس لە باوەڕدار دڵخۆشتر نییە

ئیشی بـــە ســـــادەیی وەربگرە
ئارامت لەسەر ناخۆشیەکانی هەبێ

ژیاننـــامـــەی دەیان دەوڵەمەند و گەورەپیاوی جیهانم خوێندووەتەوە، ئەوانەی کە باوەڕیان بە خودا نەبووە، ژیانیان بەتفت و تاڵی کۆتایی هاتووە و داهاتوویان بە نەفرین، هەوڵ و کۆششیان بە ڕیسوایی، باشە ئێستا ئەوان لە کوێن؟ ئەو پارە و سامانەی کۆیان کردبووەوە و ئەو کۆشك و تەلار و خانووانەی دروستییان کرد بوو کوا؟ هەموو شتێ کۆتایی هات! هەندێکیان خۆیان کوشت، هەندێکیان کوژران بڕێکی تریان لە زیندانێ کران، ئەوانی دیکەش ڕاپێچی دادگە کران، بەشێکیان بەهۆی تاوان و کەتن و ڕابواردن و گەندەڵی بوونە بەدبەختترین کەس، گاوێك وا گومانیان دەبرد بە پارە دەتوانن هەموو شتێکی وەکو بە خۆشبەختی و خۆشەویستی و تەندروستی وگەنجی بکڕن دواتر بۆیان ڕوون بووەوە بەختەوەری ڕاستی و خۆشەویستی ڕاستی و تەندروستی تەواو و گەنجی بەڕاستی بە ماڵ ناکڕدرێ!.. بەڵێ دەکرێ لە بازاڕدا بەختەوەرییەکی خەیاڵی و خۆشەویستی

ساخته‌ و ته‌ندروستی وه‌همی بکرێن، وه‌لێ هه‌موو به‌ ماڵی دونیایێ ناتوانیت دڵێك یا خۆشه‌ویستی یان خۆشبه‌تی بکڕی.

که‌س له‌ باوه‌ڕدار خۆشحاڵتر نییه‌، چونکه‌ ئه‌وان به‌رچاو ڕونن، له‌ خۆ ده‌پێچنه‌وه‌، ئه‌وه‌ی ده‌که‌ن که‌ خودا فه‌رمانی پێداوه‌، له‌ قه‌ده‌غه‌ی خودا دوور ده‌که‌ونه‌وه‌، گوێی بدێ له‌ قورئاندا وه‌سفیان كراوه‌:[ مَنْ عَملَ صَالحًا منْ ذَكَر أَوْ أُنْثَى وَهُوَ مُؤْمنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ مَّا كَانُوا يَعْمَلُونَ] (النحل :٩٧)

واته‌:هه‌رکه‌س له‌ نێر یان له‌ مێ کرده‌وه‌ی چاکی کردبێ و بڕواداریش بوو بێت ئه‌وه‌ سوێند به‌خودا به‌ ژیانێکی خۆش ده‌یان ژێنین و سوێند بێ پاداشتیان ده‌ده‌ینه‌وه‌ به‌ چاکتر له‌وه‌ی که‌ ئه‌وان ده‌یانکرد.

دره‌وشانه‌وه‌: ئه‌وه‌ی به‌خۆی نه‌یه‌وێ دڵخۆش بێ هه‌رگیز دڵخۆش نابێ.

ناوبڕ: هێ له‌ خودای که‌س له‌ ڕۆژی ڕه‌ش له‌گه‌ڵتدا نییه‌ و له‌ غه‌مێ هاوکارت نییه‌.

**بریسکە: هەموو شتێ بە قەزا و قەدەرە**

## زێوەری شەشەم:
## ژیانێکی بێ زیادەڕەوی و ڕابواردن

دۆســـــتی ئـــــازیز ســـوێند بەخوا هیچ بەڵایەك نییە لەسەر هیچ کەسێك بەردەوام بێ با بەڵایەکی گەورەش بێ

**ئافرەتی موسڵمانی چاکەکار خوان بەگوێرەی پێویست ئامادە دەکا، چێشت و خواردنێکی وا لەسەر سفرەکە نامێنێتەوە بە فیڕۆ بچێ. پێشەنگی ئەم جۆرە ئافرەتانە دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشەیە(ڕەزای خودای لێ بێ)، (لە عائیشەوە دەگێڕنەوە، فەرموویەتی: نانی جۆ نە زۆر و نە کەمی لەسەر خوانی پێغەمبەرﷺ نەدەمایەوە).**

**لە گێڕانەوەیەکی تردا: هەرگیز خوانی پێغەمبەرﷺ لەپیشی هەڵنەگیراوەتەوە کە بەرماوەی خواردنی لەسەر بووبێ).**

**لەو شتانەی ئیسلام قەدەغەی کردوون و بە زیادەڕەوی داناوە بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی زێڕ و زیوە بۆ خواردن و خواردنەوە. لە ئوم سەلەمەوە( ڕەزای خودای لێ بێ): پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: ((الذي يشرب في انية الفضة انما يجرجر في بطنه نار جهنم)). واتە: ئەوەی لە قاپی زیو دەخواتەوە وەکو ئەوەیە ئاگر هەڵقوڕێنێ.**

لە گێڕانەوەی موسلیم: ئەوەی لە قاپی زێڕ و زیو بخوات و بخواتەوە وەکو ئەوەیە ئاگری جەهەنەمێ حەپەلوش بکا)

هەر بە ڕاستی ئیسلام لەو حەڕامەکردنەی لێزانە، ئاخەر ئەو شتانە دەچنە بواری زیادەڕەوی و خۆشڕابواردن، ئیسلامیش حەز دەکا هەردەم شوێنکەوتوانی بێفیز بن و ڕانەبوێرن. لەو کاتی پێغەمبەرﷺ مەعازی کوڕی جەبەلی ناردە یەمەن پێی فەرموو: ((ئاگاداری خۆشگوزەرانی بە چونکە بەندەکانی خودای هی ڕابواردنێ نین)).

**دڕەوشانەوە: هەر کە چاوت لە غەمی دەروونت داخست دڵخۆش دەبیت.**

ناوبڕ: سەرەتا پێوەندیت لەگەڵ خودای بە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی و دوورکەوتنەوە لە قەدەغەکراوەکانی چاك بکە.

**بریسکە: هێندە گوێ بە ڕەخنە و پەلاران مەدە.**

## زێوەری حەوتەم:
## ئیشی چاك دڵ دەکاتەوە

ئەگەر پەتمان بپسێنی و دەرگامان لەسەر دابخەی خودایەکمان هەیە، ئەو زەحمەتییەمان لەسەر لابیا

**عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێت) دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێ:**

**ئافرەتێکی هەژار بە دوو کچۆڵەوە هاتە لام، منیش سەرو دەنکە خورمام دانێ، ئافرەتەکە دەنکە خورمایەکەی خۆی بۆ دەمی برد، کچەکان داوای ئەویشیان لە دایکیان کرد، ژنەش دەنکە خورمایەکەی خۆی دوو لەت کرد و سەرو لەتی دانێ و ئەوانیش خواردیان. سەرم لە ئیشی ئەو ژنەی سوڕما. بەسەرهاتەکەم بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ((ان الله قد اوجب لها بها الجنة، او اعتقها من النار)). واتە: خودا بەو شتە بەهەشتی بۆ واجب کرد، لە ئاگر ڕزگاری کرد.**

**ئەوەتا ئوم سەلەمە(ڕەزای خودای لێبێ) دەڵێ: لە پێغەمبەری خوداﷺ پرسی، ئایا لەو پارەی لە منداڵەکانم خەرجی دەکەم هیچ پاداشتێکم هەیە، ناتوانم فەرامۆشییان بکەم چونکە ئەوانە منداڵی**

منن؟ پێش وەرامدانەوە، هەر بە سروشت وەرامەکە ئەرێیانە دەبێت چونکە ئوم سەلەمە خۆی سەلماندی ناتوانێ دەستبەرداریان بێ.

ئیسلام هانی کاری چاکە و خێر دەدات و خەڵکی هەڵدەنێ سۆز و بەزەیی بنوێنن و ئەوین و میهرەبانی لە کۆمەڵگەدا بچێنن تاکو رۆڵەی چاکەکار پەروەردە بن و گەورە بن.

درەوشانەوە: دڵخۆش بە.. ئا ئەمەیە دڵخۆش بوونی ڕاستیی!

ناوبڕ: ژیان جوانە، تۆ بە باوەڕ و ڕەوشت و شەرم و شکۆتەوە.. لە ژیانیش جوانتری.

**بریسکە: ئافرەت گوڵێکی بۆنخۆش و بولبولێکی ئاوازخوێنە**

## زێوەری هەشتەم: خودا لە هەموو بەڵایان ڕزگارمان دەکا

خـــــــۆزی نێوانی مــــــن و تۆ بــــــاش دەبوو
جا با نێوانی من و هەموو خەڵکی هەر خراپ بایە!

**فڕۆکەیەك لە مەودایەکی زۆر دوور و بەرز لە نێوان عەرد و عاسمانێیە، کاتێ ئاماژەی بوونی کێشەیەك ئاشکرا کرا، دەرکەوت فڕۆکەکە لە کار کەوتووە، فڕۆکەوانەکە ترسی لێ نیشت و بووە دەنگە دەنگ، پیاو دەستییان بە گریان کرد و ئافرەتان قیژاندیان، منداڵ زەندەقیان ڕژا. ترس بڵاوبووەوە، ئەوپەڕی تەنگی و ناخۆشی باڵی کێشا بوو، هاوار و گریان و دەنگی دوعا بەرزبووەوە: یاالله یاالله یاالله. لوتفی خودای دێ و ڕەحمەتی خودای دێتە خوارێ، دڵەکان ئارام دەبنەوە و نەفس دەحەسێتەوە و فڕۆکەکەش بە سەلامەتی دەنیشێتەوە.**

**ئەگەر کۆرپەی نێو سکی دایك نەبوو، لەدایکبوونەکە سەخت بوو، دایکەکە وای بۆچوو ئیدی دەفەوتێ، مردنی هاتە پێش چاوی، با پەنا بۆ خودای لابەری غەمان و بەجێهێنی پێداویستیان ببا و هاواربکا یاالله یاالله، ئیدی ناڵە ناڵی نامێنێ و منداڵەکەی دەبێ.**

ئەگەر زانایەك تووشی ئاریشەیەكی ناقۆڵا بوو، كەوتە بار و دۆخێكی سەخت و وێڵی وەڵامێكی ڕاست بوو بەڵام دۆشداما و توشی شكست بوو، با هاوار بكا: یاالله یاالله، ئەی مامۆستای ئیبراهیم فێرم بكە ئەی ئەو كەسەی سولەیمانت تێگەیاند تێمبگەیەنە، (( اللهم رب جبرائیل و میكائیل و اسرافیل، فاطر السماوات و الارض، عالم الغیب و الشهادة، انت تحكم بین عبادك فیما كانوا یختلفون، اهدني لما اختلف فیه من الحق باذنك، انك تهدي من تشاء الی صراط مستقیم)). بەو هۆیە سەركەوتن دێ، گرێ كوێرەكان دەبنەوە، پاك و بێگەردی بۆتۆ چەند دلۆڤانی خودایە.

درەوشانەوە: ئەو كەسە زۆرترین بەختەوەری هەیە كە زۆرترین كەسی دڵخۆشكردووە.

ناوبــڕ: بە گوێڕایەڵی (الطاعة) شەڕی نەفس و هەوا بكە، بە ئیش ڕووبەڕووی دەست بەتاڵی ببەوە.

**بریسکە: هەڵا هەڵا.. لە ئافرەتان**

## زێوەری نۆیەم: ئامانە لە بێئاگایی

لەنێو بـــەڵا و مـــوسیبەتـــان نائومێد مەبە
(خۆ دەکرێ) لە نێو خۆشییدا بەڵایەك سەر هەڵبدا

**ئامانە ئاگاداری بێئاگایی بە(غفلە). بێئاگایی ئەوەیە: لە زیکر و یادی خودای دوربکەویتەوە و واز لە نوێژان بێنی، پشت بکەیە قورئان و بەشداری کۆڕ و وانە سوودبەخشەکان نەکەی، ئەمانە هۆکارن بۆ بێئاگایی. دوای بێئاگایی دڵت گەرد دەگرێ و مۆری لێدەدرێ، نە دەزانی چاکە چییە و نە واز لە خراپەی دەهێنی، هەر هیچ لەو ئاینەی حاڵی نابی، ئەو کەسەی وا بێ دڵڕەق و غەمناك و نائومێد دەبێ. بەڵێ، ئەمەیە بەرهەمی بێئاگایی لەم دونیا، ئەی دەبێ لە دوارۆژ چۆن بێ!؟ بۆیە لەسەرت پێویستە خۆت لە بێئاگایی بە دوور بگریت و بۆ خاتری خودا زمانت بە زکری خودا و سبحان الله و لا اله الا الله و الله اكبر و الحمدلله واستغفرالله و سەڵەوات لە دیداری پێغەمبەرﷺ تەڕ و پاراو بکەی. ئەوجا چ بەپێوە بێ یان بە دانیشتن بێ یان ڕاکشاو بیت، ئەوکاتە نوقمی نێو بەختەوەری دەبیت و تێر دەبیت، ئەوەش بەهۆی زیکرەوە دەبێ، خودا دەفەرمووێ: [الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ] (الرعد :٢٨)**

واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و دڵیان ئارام دەبێت بەیادی خوا ئاگادار بن کە هەر بە یادی خوا دڵەکان ئارام دەبن.

درەوشانەوە: چاوەڕێ مەبە دڵخۆش بیت ئەوسا گوڵبزەیەك بکەی، بەڵکو پێبکەنە خۆت دڵ خۆش دەبیت.

ناوبڕ: ئەوەی ڕێزی خەڵکی بگرێ خەڵکیش ڕێزی دەگرێ، ئەوەی لەگەڵییان خراپ بێ بێڕێزی بەرانبەر دەکرێ.

**بریسکە: پێشبینی بەختەوەری بکە، پێشبینی ناخۆشی مەکە.**

## زێوەری دەیەم:
## بە ڕووی ژیان زەردەخەنە بکە

لە کوخـــەکەی خـــۆت کۆشـــکێك بنیـــات بنـــێ و
لە خانۆچکە قوڕینەکەت شتێ بچنە نەك لە کۆشکە بەرزەکەت

**کاتێ دڵت لێوانلێوە لە غەم و ناخۆشی بزەیەك بکە، بەو زەردەخەنەیە ئێش و ناسۆرت کەم دەبێتەوە و دەروویێکی ڕزگاری دەکەیتەوە.. لە پێکەنین دوودڵ مەبە، لەنێو دەروونت وزەیەکی ئاگرین هەیە بۆ بزە، وریابە مەیشارەوە، چونکە ئەمە بەواتای خۆخنکاندنە لەنێو جامخانەی ئازار و سزا، ئاخەر زەردەخەنە چ زیانێکی هەیە، چ لەوەی جوانترە بە دەمێکی بە خەندەوە لەگەڵ خەڵکی بدوێی!**

**ستێڤان گەزال دەڵێت: ((زەردەخەنە ئەرکێکی کۆمەڵایەتییە))، ئەوەی ئەم قسەی سەرەوەی کردووە پێکاویەتی، کاتێك تۆ دەتەوێ تێکەڵی خەڵکی بیت لەسەرت پێویستە بە جوانی تێکەڵیان بیت. دەبێ دەرك بەوە بکەی ژیانی کۆمەڵایەتیش هەندێ زیرەکی و زانیاری مرۆیی دەوێ کە پێویستە بیزانی، یەکێ لەو بەهرانە بریتییە لە زەردەخەنە، زەردەخەنە شتێکی کۆمەڵایەتی هاوبەشە لە نێوان هەمووواندا، چونکە کە تۆ بە ڕووی ئەوانی تر**

و بەرانبەرەکەت ڕووخۆش بووی و زەردەخەنەت کرد، ئەو حانە جوانی ژیان و گیانی گەشبینیت بەوان بەخشیووە و موژدەت بە جوانترین خواستی ئەوان داوە، وەلێ کاتێ تۆ بە ڕووێکی گرژ و مۆن.

ڕوو بە ڕووی خەڵکی دەبییەوە دڵنیا بە بەو سەر و بچمەت ژیانی پاکییان شێلو دەکەی، ئاخەر چۆن ڕێ بە خۆت دەدەی ببیتە هۆی تاڵکردنی ژیانی خەڵکی!؟

درەوشانەوە: مەزنی تەنیا دەدرێتە ئەوانەی بە بەردەوامی خەونی پێوە دەبینن.

ناوبڕ: ماڵێکی وات بوێ کە غەم و خەفەت و ناخۆشی و بێزاری و تەنگی تێدا نەبێت.

# کۆتـــایی

ئێستا..

دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە ماڵئاوایی لە غەم و خەفەت بکە، پشت لە پەژارە بکە، ماڵی غەمگینی جێبێڵە و لە ڕەشماڵی نائومێدی و کڵۆڵی دوور بکەوە. وەرە و ڕوو بکە میحرابی ئیمان و ڕووگەی یارانی خودا و پایەی ڕەزامەندی بە چارەنووس.

فەرموو ژیانێکی نوێ دەست پێکە، دەبا دڵخۆش بیت، ڕۆژگارێکی نوێ دەست پێکە، وەلێ ڕۆژگارێکی جوان و ژیانێکی بێ ڕاڕایی و دڵەڕاوکێ و هەراسانی، ڕۆژانێك، بێ وەڕەزی و ناڕەحەتی و پەستی و بێ تاقەتی. بەڵێ، ئەو کاتە بانگدەری باوەڕ لەسەر لوتکە شاخی هیوا و لە گەلی ڕەزا بانگت دەکاتێ و موژدەت دەداتێ و پێت دەڵێ: تۆ (بەختەوەرترین ئافرەتی لە جیهان دا) .

## بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر

١- الإسلام وقضايا العمر
٢- دروس المسجد في رمضان
٣- فقه الدليل
٤- المعجزة الخالدة
٥- تحف نبوية
٦ - سياط القلوب
٧- هكذا قال لنا المعلم
٨- من موحد إلى ملحد
٩- إلى الذين اسرفوا على أنفسهم
١٠ - حدائق ذات بهجة
١١ - لا تحزن
١٢ - مقامات القرني
١٣ - المسك والعنبر في خطب المنبر
١٤ - ترانيم موحد
١٥ - أربعون حديثاً في الأذكار
١٦ - على بوابة الوحي

١٧ - ابيات سارت بها الركبان
١٨ - واهتز العرش
١٩ - أما بعد
٢٠ - ثلاثون سبباً للسعادة
٢١ - فاعلم أنه لا إله إلا الله
٢٢- ورد المسلم والمسلمة
٢٣ - نونية القرني
٢٤ - اقرأ باسم ربك
٢٥ - حتى تكون اسعد الناس
٢٦ - فتية آمنوا بربهم
٢٧ - ولكن كونوا ربانيين
٢٨ - إمبراطور الشعراء
٢٩ - ترجمان السنة
٣٠- العظمة
٣١ - وجاءت سكرة الموت بالحق
٣١ - احفظ الله يحفظك
٣٢ - نصائد قتلت أصحابها
٣٣ - طريقك إلى النجاح
٣٤ - مفتاح النجاح

٣٥ - على ساحل ابن تيمية

٣٦ - ضحايا الحب

٣٧ - مجالس المؤمنين

٣٨- نصة الرسالة

٣٩ - ما كان حديثاً يفتري .

٤٠ - تاج الملك

٤١ - قوت الأرواح

٤٢ - لحن الخلود (ديوان شعر )

٤٣- هدايا وغايا ( ديوان شعر )

٤٤ - حتى لا تغرق السفينة

٤٥ - السمو

٤٦ حصاد الصيف

٤٧ - تاج العروس

٤٨ - رحمة للعالمين

٤٩- تاج المدائح (ديوان شعر )

٥٠ - قصة الطموح(ديوان شعر)

٥١- مجتمع المثل

٥٢- فقه الديل مملكة البيان

٥٣- خارطة الطريق

٥٤- شخصيات من القرآن الكريم

٥٥- وحي الذاكرة

٥٦- ترجمان السنة

٥٧- حدائق ذات بهجة

٥٨- فقهيات

٥٩- قصائد قتلت أصحابها

٦٠-أعذب الشعر

٦١- التفسير الميسر

٦٢- زاد من لا زاد له

٦٣- اشكر حسادك

٦٤- ابتسم

٦٥- شباب عادوا إلى الله

٦٦- ثلاثون درسا للصائمين

٦٧- كيف تطلب العلم

٦٨- لحن الخلود.

٦٩- هدايا وتحايا.

## ناوەڕۆك

پێشكەشە ..... ٥
پێشەكی نووسەر ..... ٧
پێشەكی وەرگێڕ ..... ١١
ئەم وەرگێڕانە: ..... ٤١
نقـــێـــم ..... ١٧
دایكم ..... ٢٠
یەكتاپەرست نەك خودانەناس ..... ٢٢
لكە زێڕینەكان ..... ٢٤
بەخێر بێی ..... ٢٦
بەڵێ ..... ٢٧
نەخێر..! ..... ٢٨
گوڵ ..... ٣٠
خونچە ..... ٣٢
خشـــڵ ..... ٣٥
خشڵی یەكەم: ئافرەتێك ئالنگاری (تحدی) ستەم بوو ..... ٣٧
خشڵی دووەم: سامانێكی لەبن نەهاتووت لە ناز و نیعمەت لایە ..... ٣٩
خشڵی سێیەم: ئەوەندەت بەسە موسڵمانی ..... ٤١
خشڵی چوارەم: ئافرەتی بڕوادار و بێباوەڕ وەكو یەك نین ..... ٤٣
خشڵی پێنجەم: تەمبەڵی دۆستی شكست و ڕووخانە ..... ٤٥
خشڵی شەشەم: بەو شتانەی تۆ هەتە لە ملیۆنان ئافرەت باشتری ..... ٤٧

خشڵی حەوتەم: بۆ خۆت لە بەهەشت کۆشکێك بنیات بنێ ........................ ٤٩
خشڵی هەشتەم: بە دەستی خۆت دڵت هەلا هەلا مەکە ........................ ٥١
خشڵی نۆیەم: تۆ مامەڵە لەگەڵ خـودایەکی بەخشندە و دەستکراوە مـامەڵە دەکەی ........................ ٥٣
خشڵی دەیەم: بە هەر شێوەیەك بێت هەر تۆ براوەی........................ ٥٦
گەردانە ........................ ٥٧
گەردانەی یەکەم: بەخششەکانی خودای ئەژمار بکە ........................ ٥٩
گەردانەی دووەم: ئەو کەمە شـتەی دڵخۆشـت دەکا زۆر چـاترە لەو زۆرەی تووشی گەرداوێکت دەکا ........................ ٦١
گەردانەی سێیەم: تۆ بڕوانە هەور، هەرگیز مەڕوانە تۆز و خۆڵ........................ ٦٣
گەردانەی چوارەم: کەپرێکی تژی لە بڕوا لە تەلارێکی پڕ جەور و ستەم چاکترە.... ٦٥
گەردانەی پێنجەم: کاتەکانت بەگوێرەی ئەرکەکانت دابەش بکە ........................ ٦٧
گەردانەی شەشەم: بەختەوەری ئێمە وەکو هی ئەوان نییە ........................ ٦٩
گەردانەی حەوتەم: سواری کەشتی دەربازبوون بە ........................ ٧١
گەردانەی هەشتەم: کڕنووش کلیلی بەختەوەرییە........................ ٧٣
گەردانەی نۆیەم: پیرەژنەی لێك دەبنە دروشم........................ ٧٥
گەردانەی دەیەم: تا ببیتە ڕازاوەترین مرۆڤ لە بوونەوەر ........................ ٧٧
ئـاڵـتوون ........................ ٧٩
ئاڵتونی یەکەم: ئەی پایەدار........................ ٨١
ئاڵتوونی دووەم: بەپیل نیعمەتەکان بڕۆ و ئەرکی خۆیان بدێ ........................ ٨٣
ئاڵتوونی سێیەم: بەس تۆبە و ئیستیغفارت هەبێ ئیدی ڕۆزییت لەسەر خودایە..... ٨٥
ئاڵتوونی چوارەم: بە دوعایان تەنگ و چەڵەمەت لێ دوور دەکەوێتەوە...... ٨٧

ئاڵتوونی پێنجەم: وریای بێئومێدی و داڕووخـــــان بە.......................٨٩
ئاڵتونی شەشەم: ماڵی خۆت شانشینی سەربەرزی و خۆشەویستییە ...........٩١
ئاڵتوونی حەوتەم: ئاگادار بە تۆ کاتی زۆر گوتنت نییە.........................٩٣
ئاڵتوونی هەشتەم: دەروون ڕووناك بە دونیا سڵاوت لێ دەکا......................٩٥
ئاڵتوونی نۆیەم: نەبووە و نەگونجاوە بەخـــتەوەری بە تەواوی بۆ کەســێك
هاتبێتە دی یان تەواوی خێر و خۆشی بۆ مرۆڤێك بووبێ. ......................٧٩
ئاڵتوونی دەیەم: بڕۆ نێو باغی زانیاری.........................................٩٩
**مرواری**.........................................................................١٠١
مرواریی یەکەم: شۆڕابەی فرمێسکان و دڵی بریندارت لەبیر بێ ...............١٠٣
مرواریی دووەم: ئەوانە بەختەوەر نیین...........................................١٠٥
مرواریی سێیەم: ڕێبازی خودا باشترین ڕێیە......................................١٠٦
مرواریی چوارەم: ئەگەر ڕێگاکانت لێ تەنگ بوو هۆشێکت بە خوداوە بێ ١٠٨
مرواریی پێنجەم: هەموو ڕۆژێکت بکە تەمەنێکی نوێ.............................١١٠
مرواریی شەشەم: ئافرەتان ئەستێرەی ئاسمان و هەسارەی تاریکین...........١١٢
مرواریی حەوتەم: مردن نەك حەرام ..............................................١١٤
مرواریی هەشتەم: چەند ئایەتێك و درەوشانەوەیان ...............................١١٦
مرواریی نۆیەم: خوداناسی غەم و خەفەتان ناهێڵێ ...............................١١٩
مرواریی دەیەم: ڕۆژە پیرۆزەکە ...................................................١٢١
دوڕ ..................................................................................١٢٣
دوڕی یەکەم: ژنێکی تێگەیشتوو بریتییە لە ژیانێکی بەختەوەر...................١٢٥
دوڕی دووەم: تەنیا بۆ ئەمڕۆت کار بکە...........................................١٢٧
دوڕی سێیەم: واز لەو هەستەی بێنە کە پێت وایە چەوساوەی...................١٢٩

دوڕی چوارەم: ئای سەرکەوتن دوای هەوڵ و ماندووبوون چەند خۆشە!....١٣١
دوڕی پێنجەم: لەگەڵ بارودۆخی خۆت ڕادێی........................١٣٣
دوڕی شەشەم: چەند ئامۆژگارییەکی ڕاست و دروست لە دایکێکی ژیرەوە ..١٣٥
دوڕی حەوتەم: ئەو ئافرەتەی هەوڵ دەداو تێدەکۆشێ خودای لە خۆ ڕازی دەکا........................................................................١٣٧
دوڕی هەشتەم: ئەو ئافرەتەی سنوورەکانی خودای بپارێزێ خوداش ئەو دەپارێزێ ...١٣٩
دوڕی نۆیەم : ئاوی تۆبە پاکترین ئاوە........................١٤١
دوڕی دەیەم: یەکەم گیانفیدا........................١٤٣
زەبـــەر........................................................................١٤٥
زەبەری یەکەم: بنوو بێ غەم و خەیاڵ خودا یەکەو دەرکەی هەزار ..........١٤٧
زەبەری دووەم: کوێری ڕاستەقینە کوێری دڵە........................١٤٩
زەبەری سێیەم: دادگەی تۆڵەســەندنەوە دامەمەزرێنە با خـۆت یەکەم قوربانی نەبیت........................................................................١٥١
زەبەری چوارەم: نایابی لە کارکردن........................١٥٣
زەبەری پێنجەم: دونیای بێ باوەڕی لە نێو سەرگەردانی ئازار دەچێژێ.......١٥٥
زەبەری شەشەم: لە ڕەوشتەکانی هاوژین........................١٥٧
زەبەری حەوتەم: بەوە ڕازی بە کە خودا بۆی داناوی........................١٥٨
زەبەری هەشتەم: ئاخ و داخ بۆ دونیا مەخۆ........................١٦٠
زەبەری نۆیەم: ئەوپەڕی جوانی لە دروستکراوەکانی خودا هەیە ............١٦٢
زەبەری دەیەم: ئەوپەڕی بەخشندەیی و لوتکەی دەستکراوەیی ............١٦٥
**یاقووت** ........................................................................١٦٧
یاقووتی یەکەم: جێگرەوەی خودای نییە ........................١٦٩

یاقووتی دووەم: بەختەوەی هەیە بەڵام کێ وەیدۆزێ؟...................... ١٧١

یاقووتی سێیەم: ڕەوشت بەرزی بەهەشتێکە لە دڵدا ..................... ١٧٣

یاقووتی چوارەم: دە بەندی بەختەوەری ..................................... ١٧٥

یاقووتی پێنجەم: لە هەموو غەم و خەفەتێك پەنا بە خودا بگرە ............... ١٧٧

یاقووتی شەشەم: ئەو ئافرەتەی کە پشتوانی لە کات و ساتە سەختەکان بۆ هات.... ١٧٩

یاقووتی حەوتەم: ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشت..................................... ١٨١

یاقووتی هەشتەم: بەخشین پێش بە بەڵا دەگرێ.................................. ١٨٣

یاقووتی نۆیەم: با ڕۆحت جوان بێ چونکە بوونەوەر جوانە....................... ١٨٥

یاقووتی دەیەم: ئافرەتێك پاڵەوانییەتی تۆمار دەکا................................ ١٨٧

**گەوهەر** ............................................................................. ١٨٩

گەوهەری یەکەم: کات و ساتی خۆت لە هیچ و خۆڕایی بەسەرمەبە ......... ١٩١

گەوهەری دووەم: بەختەوەری بە پارە ناکڕدرێ..................................... ١٩٣

گەوهەری سێیەم: پەلەپەل و زوو هەڵچوون سوتەمەنی سەختی و ناخۆشیین...... ١٩٥

گەوهەری چوارەم: یاری کۆکردنەوەی پارە کۆتایی نایێ........................ ١٩٧

گەوهەری پێنجەم: لە بێکاریدا هەر ناخۆشی دێتە بەر........................... ١٩٩

گەوهەری شەشەم: ماڵێکی بێ توڕەیی و هەرا و هۆریا و شەکەتی .......... ٢٠١

گەوهەری حەوتەم: داوێنپاکی و شەرم جوانی ئافرەت زیاد دەکات ........... ٢٠٣

گەوهەری هەشتەم: خودا نادیاران دەگێڕێتەوە.................................... ٢٠٥

گەوهەری نۆیەم: پەیڤێك هەموو کات و شوێنێك پڕ دەکا........................ ٢٠٧

گەوهەری دەیەم: دڵانێك تامەزرۆی بەهەشتن ..................................... ٢٠٩

**ئەنگوستیلە** ......................................................................... ٢١١

ئەنگوستیلەی یەکەم: بڕواهێنان بە خێر و شەڕی چارەنووس ................. ٢١٣

ئەنگوستیلەی دووەم: باشترین کار میانەییە..........................................٢١٦
ئەنگوستیلەی سێیەم: ڕەشبینی غەم و خەفەتان لە خۆی کۆدەکاتەوە........٢١٨
ئەنگوستیلەی چوارەم: ئامانە وریای سەرزەنشت و بێزاری و خەشم بە......٢٢٠
ئەنگوستیلەی پێنجەم: زۆربەی کێشەکان بەهۆی شتی هیچ و بێ مانایە....٢٢٢
ئەنگوستیلەی شەشەم: هونەری پاراستنی زمان.........................................٢٢٤
ئەنگوستیلەی حەوتەم: بە نوێژ شەڕ لەگەڵ دڵەڕاوکێ بکە..........................٢٢٧
ئەنگوستیلەی هەشتەم: چەند ئامۆژگاریەکی ئافرەتێکی سەرکەوتوو............٢٢٩
ئەنگوستیلەی نۆیەم: ئەوەی بە خودای دڵخۆش نەبێ بە هیچ شتێ دڵخۆش نابێ.........................................................................................٢٣١
ئەنگوستیلەی دەیەم: خاوەن دوو پشدێن دوو جار دەژیێ............................٢٣٣
**وتە ناوازەکان**...................................................................................٢٣٥
ناوازەی یەکەم: کێ ئازیزترین کەستە؟........................................................٢٣٧
ناوازەی دووەم: بەختەوەری هیچ پێوەندی بە دەوڵەمەندی و هەژاریەوە نییە...٢٣٩
ناوازەی سێیەم: ئەرێ خودا لە کەسانی تر شایەنتر نییە تاوەکو سوپاسگوزاری بین.....................................................................................................٢٤١
ناوازەی چوارەم: ئافرەتی بەختەوەر کەسانی دەوروبەری خۆی دڵخۆش دەکات....٢٤٣
ناوازەی پێنجەم: دڵنیا بە هەموو شتێك بە قەزا و قەدەرە..........................٢٤٥
ناوازەی شەشەم: ئوم عەمارە دەدوێ.........................................................٢٤٧
ناوازەی حەوتەم: چاکەکردن لەگەڵ خەڵکی غەم و خەفەتت ناهێڵێ........٢٤٩
ناوازەی هەشتەم: زیانەکانت بکە قازانج....................................................٢٥١
ناوازەی نۆیەم: وەفا زۆر بەنرخە، ئەرێ وەفاداران لە کوێن؟.......................٢٥٣
ناوازەی دەیەم: هەتەر (جدی) بە.. هەتەر..................................................٢٥٥

مەرجـان.......................................................................٢٥٧
مەرجانی یەکەم: بەئازایی لەگەڵ نەفسی خۆت بوەستە ........................٢٥٩
مەرجانی دووەم: وریا بە ....................................................٢٦١
مەرجانی سێیەم: سوپاسگوزاری چاکەکاران ئەرکە............................٢٦٢
مەرجانی چوارەم: بۆ چاودێری ڕۆح لە جەستە لەپێشترە .......................٢٦٤
مەرجانی پێنجەم: نان ئەو نانە ئەمڕۆ لە خوانە ...................................٢٦٦
مەرجانی شەشەم: تەنگ و چەڵەمە گەنجینەی ویستەکانن.......................٢٦٨
مەرجانی حەوتەم: بەزەییت بەوانەدا بێتەوە لەسەر زەویین ئەوەی لە ئاسمانە
بەزەیی پێتا دێتەوە ...........................................................٢٧٠
مەرجانی هەشتەم: ئەم دونیای جوانە هەر تەنێ گەشبینەکان دەیبینن ......٢٧٢
مەرجانی نۆیەم: خودای لە شێنەیی بناسە ئەویش لە تەنگانە دەتناسێ......٢٧٤
مەرجانی دەیەم: ئافرەتێکی خاوەن زۆرترین مارەیی لە جیهاندا.................٢٧٦
ئەڵمـاس.......................................................................٢٧٩
ئەڵماسی یەکەم: کلیلەکانی سەرکەوتن ........................................٢٨١
ئەڵماسی دووەم: دوای ئاریشە و ناخۆشی تام و چێژی سەرکەوتن دێ........٢٨٢
ئەڵماسی سێیەم: دوودڵی هزر و جەستە ئازار دەدا.............................٢٨٤
ئەڵماسی چوارەم: ئیش و کاری بەدڵی خۆت ڕازی بەختەوەرییە ................٢٨٦
ئەڵماسی پێنجەم: هێز لە دڵدایە نەك لە جەستە ...............................٢٨٧
ئەڵماسی شەشەم: ئافرەتی سەلار جەهەنەمی ناخۆش و دەرد دەکاتە بەهەشت...٢٨٩
ئەڵماسی حەوتەم: ئارام بگرە تا سەرکەوتوو بیت ................................٢٩١
ئەڵماسی هەشتەم: لە قەیراندا هێ لە خودای چ پەناگیرمان نییە...............٢٩٣
ئەڵماسی نۆیەم: ئەرێ هەر خودا نییە تکای لێقەوماوان وەردەگرێ ...........٢٩٥

ئەڵماسی دەیەم: ئەوەی قرچۆکی دەکا ئەوا ڕژدی لەبارەی خۆیەوە دەکا....٢٩٧
زێــوەر.........................................................................٢٩٩
زێوەری یەکەم: تۆ ئافرەتێکی مسوڵمانی و نە ڕۆژهەڵاتی و نە ڕۆژئاوایی...٣٠١
زێوەری دووەم: غەمەکانت لەبیر کەو بە قوڵی ئیش بکە......................٣٠٣
زێوەری سێیەم: ئەو خاڵانەی یارمەتیت دەدەن بۆ بەختەوەری.................٣٠٥
زێوەری چوارەم: ئەگەر هەموو پەتەکان پچڕان پەتی خـۆت بە هومێدی خودای
گرێ دە.......................................................................٣٠٧
زێوەری پێنجەم: کەس لە باوەڕدار دڵخۆشتر نییە..............................٣٠٩
زێوەری شەشەم: ژیانێکی بێ زیادەڕەوی و ڕابواردن.............................٣١١
زێوەری حەوتەم: ئیشی چاك دڵ دەکاتەوە......................................٣١٣
زێوەری هەشتەم: خودا لە هەموو بەڵایان ڕزگارمان دەکا........................٣١٥
زێوەری نۆیەم: ئامانە لە بێئاگایی.............................................٣١٧
زێوەری دەیەم: بە ڕووی ژیان زەردەخەنە بکە...................................٣١٩
کۆتــایی......................................................................٣٢١
بەرهەمە چاپکراوەکانی نووسەر................................................٣٢٢

# بەختەوەرترین ئافرەت لە جیهاندا

ئەم کتێبە یەکێکە لە کتێبە هەر باش و دانسقەکان. بۆ چەندین زمانی دونیا وەرگێردراوە. بە سەدان هەزار دانە بە زمانگەلە زیندووەکانی دونیای لێ فرۆشراوە و دەیان جار چاپکراوەتەوە.

خوێندنەوەی ئەم کتێبە ڕاستەوخۆ هەندێ شت لە ژیانت دەگۆڕێ، هەست دەکەی پەیڤەکانی دەبنە وانە و ئاگادارکەرەوە، لەگەڵ ساتەکانی ژیانت ئاوێزان دەبێت.

ئەم کتێبە پردی بەیەکەوە بەستانی ڕۆژگاری پڕشنگداری دوێنێ و ئێستامانە، فێرمان دەکات پەند لە بەسەرهاتی پێشینە باشەکانی وەربگرین و ئیش بە ئامۆژگاری ئەوان بکەین.

بەرگ: ئیبراهیم ساڵح


دەزگای حاجی

لقی یەکەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرانبەر مزگەوتی مەحموود عەللاف
لقی دووەم: هەولێر - بەرانبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ M.Ktebxana نرخ: ٥٠٠٠

حاجی
دەزگای حاجی